# دیوانی شاخی

.

* أبوبکرمحمدحاجی ( مەلاشاخی )
* شیعر
* چاپی یەکەم
* تیراژ ( ١٠٠٠ ) دانە
* چاپخانە نەورۆز
* هەرێمی کوردستان ٢٠٠٩

زنجیرە(٧) لەپرۆژەی( ١٠ ) کتێبی شاعیر

# پێشکەشە :

* به شاعیرانی شەهید مەلاعەلی وجەمیل رەنجبەر و
  بەرزان عوسمان و نەعمان دڵسۆز ...
* به شەهید و ئەنفالکراوەکان کەهەوێنی بەرهەمەکانمن
* به دایکم .. کەبۆکوردایەتی گەورەی کردم .
* بەگوڵەسوور که بەخۆشەویستی فێری شیعری کردم

## له جیاتی پێشەکی

**بۆئەوەی چەند راستییەکی پێویست لە خوێنەرانی ئەم دیوانە شیعرییە ڕوون وئاشكرا بێت ، بەپێویستم زانی ئەم خالأنەی لای خوارەوە لەجیاتی پێشەکی پێشکەش بکەم :**

* بەپێی سەرژمێری ١٩٥٧ ساڵی لەدایك بوونم بەساڵی ١٩٥٠ خەمڵێنرابوو، دواتر بۆئەوەی لەسەربازی رزگارم بیٚ کردمیان بەلەدایك بووی ١٩٥٣ بەلأم مێژووی راستەقینەی بوونم بریتییە لە ٢٥ ی تەمموزی ١٩٥٢

* سەرەتای شیعرنووسینم دەگەڕێتەوە بۆسالأنی ١٩٦٧-١٩٦٨

* زۆرجاران بەناوی( أبوبکرشاخی، ب ئارام ، ابوبکرشیخ بزێنی) بابەتم بلأودەکردەوە.

* یەکەم بەرهەمی شیعریم بەناوی (گزنگی زێڕین)ەوە لەکۆتایی ساڵی١٩٧٣ پێشکەشکرد بە وەزارەتی رۆشنبیری عیراق بەمەبەستی (مۆڵەت) ، بەلأم ئەگەرکەسێك بەناوی (هیوانەقشبەندی)کەئێستا

نـــازانم لـــەکوێ و چ کارەیـــە ئاگـــاداری نەکردمایـــەوە تووشـــی لێپرسینەوەش دەبووم، شیعرەکانیشم تیا چوون.

* لەسەردەمی پێشمەرگایەتی شۆڕشی ئەیلول وشۆڕشی نوێی گەلەکەمانـــدا شـــیعرەکانم لەگـــەڵ چـــەکەکەمدا لەســـەنگەری بەرگریدابوون.

* لەگۆڤارو رۆژنامەکانی شاخ چەندی بابەتم بلاْوکردۆتەوە وەك :

(( راپەڕین، گزنگ ، رزگاری ، نووسەری چیا، کرمانج،، بانگ ، نووسەری کوردستان ، بەرەی کوردستانی،...))

* یەکـــەم دیوانەشـــیعرم بـــەناوی (داســـتانی ئـــاوارەیی) لەساڵی١٩٨٩ لەشاری نەغەدە چاپ وبلاْوکرایەوە.

* دووەم دیوانە شـیعرم بەر لە ڕاپەڕینی سـاڵی ١٩٩١ بە ناوی (هۆرەی چیا)ەوە، لەلایـەن( یـەکێتی نووسـەرانی کوردستان)ەوە لە

(چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ) چاپ و بلاْوکرایەوە.

* (ئـەنفال وشـۆڕەبی) و (شـیوەنێك بۆڕەنـدیخان ) لـە یـادی کیمیابارانی (گۆپتەپـە) لەلایـەن (کۆمەڵـەی رووناکبیری کـەرکوك )ەوە چاپ وبلاْوکرانەوە

* ئـەم بەرهەمـەی ئێـستا پێـشکەشی دەکـەم بریتییـە لەکۆبەنـدی زۆربەی شیعرەکانم ،جگە لەچەندشیعرێك نەبێت کەپێم باش بوو لەم قۆناغەدا... بلأویان نەکەمەوە..!
* لـە دوای نـسکۆی شـۆڕش لـە ١٩٧٤ و لەسـەردەمی ئـەنفال و لەســالّی ١٩٩٦ چــەندین شــیعرو دەسنووســی منــیش بــێ سەروشوێن بوون...

**شـــاخی**

**٢٠٠٩ کەرکوك**



# تەیمان

---

٭ بەرلەڕاپـــــەڕینی ١٩٩١لـــە ( دەنگـــی گـــەلی کوردســـتان) و لەبەرنامـــەی (یـەکێتی نووســەرانی کوردســتان) دا، بــە یــەکێك لەشــیعرە بــەرزەکانی ئــەدەبی بــەرانگاری کوردســتانی وجیهـانی حیساب کرا.

گەر بتوانن ..

بەچەکی نوێ،

شاخەکانمان بکەن بەگەرد.

گەربتوانن..

رێی رێبواران کوێرکەنەوە،

ئاگربەردەن لە داروو بەرد.

گەربتوانن ،

بە فێڵی نوێ..

لوتکە بەرزەکان داگیرکەن.

گوند و شارمان بڕوخێنن،

لەگشت لایێ ڕەشبگیرکەن.

گەر بتوانن..

زەبر بنوێنن ، بخورن .

ویژدانی لاواز ،بکڕن.

قەت ناتوانن

شۆڕش وخەڵکی چەوساوە،

کوردستان و پێشمەرگە، لێك دابڕن.

گەربتوانن ..

بەکۆمەکی کۆنەپەرست،

وەکو فاشیست،

ساوای بێتاوان بێ شیرکەن.

بەری خۆری زانست بگرن.

هەزاران نۆلاو یەخسیرکەن

گەربتوانن..

داربەڕوی کێوان هەڵکێشن،

سندم لە پێی زێ و ڕوبارکەن.

کەو و سوێسکە ..بخەنەداو

ماسیش..لە ئاودا بێزارکەن.

قەت ناتوانن.

لەنێوانی شۆڕش وگەل،

پێشمەرگە و چەك..

یەك بستۆکەیەك دیوارکەن.

گەر بتوانن ..

بە کۆمەکی خەڵکی دزێوی خێڵەکی

دەرگای شارەکان کلۆم کەن.

بۆردومانی لێرەوارو...

هەردە و جۆم کەن.

وەکوشاری (هیرۆشیما)و(ناکازاکی)

لەکوردستان...

ئەزموونی چەکی ئەتۆم کەن.

گەر بتوانن..

لەشاخەوە،جەنگ بگوێزنەوە،

بۆ دەروون.

ژن لەمێردی پەشیمان کەن.

هەروەکوجاری جارانی ...

بکوژن ،ببڕن،وێران کەن.

قەت ناتوانن ...

لەنێوانی خاك ومرۆڤـ ،

بزوتنەوەو پێشڕەوەکەی،

یەك بستۆکەیەك(تەیمان)کەن

بەرەی قەیوان — ماوەت/ ١٩٨٦

# شۆڕشی شێت

له بیرەوەری ڕێكەوتنەكەی جەزائیردا

پێشكەشەبە(رەسوڵەشێت) ی سەرگەڵۆ

پیاوێکی پیر

هەواڵێكی دڵتەزێنی پێدرابوو

وەكومەكۆی مامەجۆلاّی بن دالاّنیّ.

لەبەرخۆوە،بۆڵەی دەهات،

هاتووچۆی بوو.. لەسەربانیّ.

وەك منالّی دایك مردوو.

وەك مرۆڤی جگەركون بوو

دابووی لە هۆڕەی گریانیّ :

زۆر بینراوە ..

بەفر هەرەسی هێناوە لەبەرهەتاو.

نەبینراوە،نا نا.. هەرگیز نەبینراوە

مرۆڤـ ئاوا هەرەس بهێنیّ لەناكاو.

( ١٥) سالّە ..

چی نەفام وبیر منالّە .

پێم دەڵێن ( شــێت ).

ئێ دەبا هەرپێم بڵێن شێت.

ئەی خەڵکینە..

کە دەبینم(برنەو)دەمی دادەخرێت.

کەدەبیسم فیشەك دەمرێ و

لەگۆڕ دەنرێت.

دار وەك ئافرەتی کۆستکەوتوو

پرچی دەڕنێت ...

گڕ دەسێنم،جەرگم دەسوتێت.،

کەدەبیستم،لەپاش کۆچتان ،

دەمی چەقۆی جەلادەکان ،

بەخوێنی سوورتان،دەنەخشێت.

کوڵدەسێنم...گریانم دێت.

کەدەزانم ..لەسەر سنوور..

مرۆڤی کورد،سەودا دەکرێت،

دەفرۆشرێت.

ژیر دەبمەوە،قسەم بۆ دێت:

بۆکوێ دەڕۆن !؟

مەکەن ..بەجێمان مەهێڵن !

ئێوەبڕۆن ..

ئیترکێ جگەرەم داتێ ؟؟.

ئێوەبڕۆن..

ئیتر کێ بۆم بکرێ قاتێ ؟.

ئیتر کێ چام بۆبکرێ .

کێ سەروریشم بتاشێ،

نەشیان برێ ؟!.

بۆکوێ دەرۆن ؟

مەکەن بەجێمان مەهێڵن !

ئێوە برۆن ،

حوشتربە(پلەی دابان)دا سەردەکەوێ.

ئێوە برۆن ،

سەری بەرزی ( پیرەمەگرون)

لەژێر چەکمە وپۆستاڵی رەش دادەنوێ.

نا نا مەرۆن !

ئێوەبرۆن ،

توتەڵەسەگی بیابان ،

**لەسێبەری چنارەکانی(بەرگەڵوو)**

**وەردەکەوێ .**

**نەکەن بڕۆن !**

**دوای ڕۆینتان،**

**مردوو لەگۆڕدەردەکرێ .**

**چیا دەڕوخێ، دار دەمرێ.**

**کانی هێندبەکوڵ دەگرێی،**

**تەڕی لەچاوانی دەبڕێ.**

**دایك جەرگی لەت لەت دەبێ،**

**دڵی دەشکێ،**

**سۆمای دادێ،**

**بۆ پێشمەرگە .. لەپ دەکوتێ.**

**٦| ٣|١٩٨٥ سەرگەڵو**

---

★ ئەم شـیعرە لە نەورۆزی (١٩٨٦) دا لە دەشتی کۆیە و

لە نەورۆزی ( ١٩٨٩ ) دا لەئۆردوگای( لاوێن )خوێندراوەتـەوە.

## سروودی

## ڕێبواری خەبات

ڕێبواری خەبـات تیژڕەوێکی ڕێـم
دڕك وداروبەرد دەخەمە ژێرپێم
لە ڕۆژی جارێك خۆراك نەگاپێم
دیــداری ئـازیزحەرام بـکەن لێم
بسوتێنن شاروهەوار..لەگەڵ دێم
هەرڕۆژە لەبن ئەشکەوتێك بژێم

پەیمان سەدپەیمان بەخـوێن وبەگیان
گەرسـەدئەوەندەبکرێین تۆپـباران
پێشمەرگەین هەرگیزنابین پەشیمان
درێـغی ناکەین قەت لـە تێکۆشــان

(وان )و (قامیشلی) هەمووکۆچەر کەن

(کەرکوك)و(سنە)گشت دەربەدەرکەن

بە ناپاڵم وتۆپ گوێ ی چیاکان کەڕکەن

بە(مێك) و(سیخۆی )یاری(کۆپتەر)کەن

پاڵە و رەنجدەران ،تووشـی زەرەرکەن

ئاگر بارانی گشت دەشـت و دەرکەن

پەیمان سەدپەیمان بەخوێن وبەگیان

گەرسەدئەوەندە بکرێین تۆپـبـاران

پێشمەرگەین هەرگیزنابین پەشیمان

درێغی نـاکەین قـەت لە تێکۆشـان

ئەو دایــکەی منی کردوە بەم لاوە

هێندەم خۆش دەوێ گلێنەی چـاوە

لە نـــاخۆشـیدا زۆر بـۆم گریا وە

بیگرن،بەندی کەن،نەژی لەم ناوە

بیبەنە(بەغدا)و(کووت)و(سەماوە)

چـونکە چەوسـاوەم بەڵێـنم داوە

پەیمان سـەدپەیمان بەخوێن وبەگیان

گەر سەد ئەوەندە بکرێین تۆپـبـاران

پێشـمەرگەین هەرگیزنـابین پەشیمان

درێغی نـــاکەین قـەت لە تێکۆشــان

هاوســـەری ژیــانم کە وەفـادارە

هـاوڕێ ی خەباتی سەخت ودژوارە

لە خەم وشادی وەك من بەشدارە

لە (کوێستان)ی کەن بەرەوئەوخوارە

بیبەنە گەرمای (بەسرە)و(عەمارە)

چونـکە رەنجدەرم ..ئەمە بڕیارە

پەیمان سەدپەیمان بەخوێن وبەگیان

گەر سەد ئەوەندە بکرێین تۆپـبـاران

پێشمەرگەین هەرگیزنابین پەشیمان

درێغی نـاکەین قـەت لە تێکۆشـان

١٩٨٣. رەزگە

---

★ لە ژ(١٠) ی گۆڤاری گزنگ دا بلاوکراوەتەوە

★★ لە ژمارە (٢) ی گۆڤاری (نووسەری چیا)دا بلاوکراوەتەوە.

★★★ لایەن تیپی مۆسیقای سلێمانی یەوە کراوە بە سروود.

★★★★بەسەدان جار لەلایەن شاعیرەوە بۆ پێشمەرگەکان خوێندراوەتەوە

# مۆڵەت

مۆڵەتم دەن !

با بەنێچیرڤانی شیعرم

ئاسکۆڵەی سرکی سەرنجتان ،

کەمەندبکەم .

گوێچکە هەڵخەن بانگەوازە:

ئەوەتانێ، لەداوێنی ئەم خاکەوە

فەرمانی کوردی هەژارو بەلەنگازە.

★ ★ ★

سەرنج بدەن: وا هاوارە.

دەنگ بۆتەبلَندگۆی مزگەوت و

خامە بووە بەمنارە.

( شێخی پیران )ی هۆزانم

تیا بانگ دەدا بۆمشەختی وبۆئاوارە:

کێ لەم پەندەم حاڵی دەبێ ؟:

رێگا مەدەن !

کۆنەزامەکەی( دەرسیم )م بکوڵێتەوە .

چونکە هێشتاخوێنی دەڕواو...

ساریْژ نەبووە،بەئازارە.

مۆلّەتم دەن!

با بە هەتوانی هۆنراوەم

برینی سوتماکی زەوی تیماربکەم

سەرنج بدەن ! بانگەوازە ،

نالّەم (نالّەی جودایی) یە

گویْم لەشیعر و لەئاوازە.

لەگەلّ (تاریك وروناك)دا

پۆلیّ وشەی تورەتورەی مامە(هیْمن)

(سروە)ی بەیانی دەیهیْنیّ .

کیّ لەم پەیڤە حالّی نابیْت ؟!

کاتیّ مرۆڤ، ئاوارە بوو

دەبیّ دیدی فرەوان بیّ

ورد ترین تاوان ببینیّ .

کەماف وئابرو وئاواتی پیْشیْلکران،

دەبیّ بە لوتکەی هەستەوە

نالّەی.. بەردیش بهەژیْنیّ.

★ ★ ★

مۆڵەتم دەن !

با پەنجەرەیەك لەرابردووبكەینەوە.

سووكە ئاورێك بدەینەوە.

ئەوە دیرۆكی دێرینەم

(نوری ...)*بینای چاوەكانم

كاتێ سنوور دەبەزێنێ .

چەكی نابێ،گوللەی نابێ ،

بەرەو دوژمن بیتەقـێنێ.

رەوەجۆخوركەو سینگزەردەی،

زۆردارەكان بتارێنێ.

بەناچاری پەنادەبا بۆ پێنوس و

بۆ نەوەی گەل،دەیسەلمێنێ.

مەرد ئەومەردەیە،خۆگربێ.

نیشتیمانی نەدۆڕێنێ.

* * *

مۆ ڵەتم دەن !

ئەوەئەزمونی خەباتم

یاداشتێكم بۆهێناون دەیخوێنمەوە،

وەکو شاگردێکی (ئارام)

رابردوو تان بیردێنمەوە.

یادی چوارسەرکردەی مەزن،

چوارئەفسەری مەرگ بەزێن

لەناختاندا...دەژێنمەوە .

ئەوە(هاوکاری)سای ئاشتیم

زنجیرەی خەباتی گەلان

هەرگیز لێك ناپسێنمەوە .

ئەگەر دوێنێ لە(وربامۆ)ی موزەنبیق دا

خوێنی سەدان چەوساوەیان

بەبێ سوچ وتاوان رژاند .

ئەوە (خەبات)ی رابردوم

لە ( داکان ) دا.. داگیرکەرانی ولأتم

(خواروی ئەفەریقا) شیان بەزاند.

★ ★ ★

ئەگەردوێنێ

لە(سەبرا) و لە(شاتیلا)دا

لە(تەلزەعتەر)ی ئەرخەوان..

ویژدانی دنیایان هەژان .
ئەوە (حەیران )و(لاوك) م
لە ئەشکەوتەکەی (سۆریا)دا
دەیان چەوساوەوهەژاریان
لەنێو گلێپەو گڕدا برژان.
ئەگەردوێنێ
جووتێ خوشکۆڵەی بێتاوان
(هێرۆشیما) و (ناکازاکی)
نێو چەقەدوکەڵدا خنکان.
لێرەیش وا لەم رۆژگارەدا
لەچەرخی رزگاری گەلان،
لە( هەڵەبجە)و( شێخ وەسانان)
لە(گۆپتەپە)ولە(بالیسان)
لە(روشین )و(گەلی بازی )
لە کوردستانی ژارو ژان
گەلای هەزاران تەمەنیان
بەچەکی(کیمیاوی) تەکاند.

★ ★ ★

مۆڵەتم دەن!

با دەلاقەیەك لەسینەم بكەمەوە

وا كڵپەیەك..لەناخەوە دەمسووتێنێ.

ئێستا لەشاری كەللەمدا

لەشەقامی شانەكانیا،راپەڕینە...

(شەوگێڕ):نۆبوكی قوڕبەسەرهاواردەكا !

تەماشای (سەربڕاو)م كەن !.

( ئۆمەربەگ) یش

لەسەر تەرمی لاوەكانی دەناڵێنێ:

سەیری جەرگی زوخاوم كەن !.

(چیمەن) ی شەلالی خوێنیش دەزریكێنێ:

دە خە ڵكینە !

چاو بدەنە سینەی لەتم

تا بزانن ( هیوا)م كێ بوو!

ئەوسابەگەرووی تاساو و

بەرەنگی هە ڵبڕكاوەوە

بۆنی دڵ و هەناوكەن.

(زێوە)یش گڕی لێ هەڵدەستێ

کێ بینیویە، لەخیوەتی ئاوارەیی

کۆرپە لەبێشکەدا بسوتێ !؟

وەرن.. بەوردی چاودێری ،

ئەم دڵەی هەڵقرچاوم کەن.

نیشتیمانم. سەرانسەری بورکانێکە

دەتانەوێ دەریای ڕقتان شەپۆل بدا؟

پرسیاری شاری وێرانەو...

دیدەنی دێی روخاوم کەن !!

سەرنج بدەن !

بائەمجارەیش،بەدنیا راگەیەنمەوە.

تا چەوسانەوە بمێنێ،

(شۆڕش)م ناکوژێمەوە.

نەك (هەڵەبجە)و( قەڵادزێ)

لە(زاخۆ) هەتا( مەندەلی)

شوێنەوارم بسڕنەوە،

چی نەرزگەی دێرینە یە،

گۆڕستانی شەهیدانیش،

هەر هەمووی هەڵبگێرنەوە.

نەك ئەمجارە..چەندجاری تر ،

سواربیمەوە،بگلێمەوە،

بۆ نەوەی داهاتوی گەلم،

لەسەرسنوور...

دوژمنکاریش بنێنەوە،

دەست بەرداری خاکم نابم!

سنوری مە تا( حەمرین) ە

ئەی ولأتە وێرانەکەم !

هەردێمەوە،هەردێمەوە، هەردێمەوە.

★★★

سەرنج بدەن!

چاوم لە ئاسۆی روناکە

ئەمە ئالأی بەرزی منە.

(نەسرەوتن تاسەرکەوتن)ە

لەسای ئەو ئالأ مەزنە ،

هاواردەکەم:

دوژمنان دوا تیرتان هەڵدەن،

هەرچۆن دەتوانن ڕاوم کەن.

سبەی بڵێسـەی ڕقی پیرۆز

لەجەستەتان بڵند دەبێ

ئەوسا تەماشای هەڵمەتی،

( ئافرەت )و( پیر )و(لاو)م کەن.

نەغەدە ١٩٨٩/٦/١٩

---

ئەم شیعرە ڕۆژی ١٩٨٩\٦\١٩ لەبارەگای کۆڕی ڕۆشنبیری لاوانی کورد لەکۆڕێکدا لەلایەن شاعیرەوە خوێندرایەوە .

## شارستانیەت

لەزۆر شوێنی ئەم دنیایە.

باو ئاوایە.

شـارسـتانیـەت،هەنگاو هەنگاو

تارماییەکان دەبزێنێ

خێرا خێرا..دێتەپێشێ.

زانست بەرەو کاکەشانی فەلەك،

بالأدەکا...

رەگی گیاکەڵەی دواکەوتن

لەڕیشەوە هەڵدەکێشێ.

کەچی لەگەڵ هەرهەنگاوێ

لەنیشتمانی ئێمەدا،دەستی تاوان

دوو هێڵی ڕەشی ڕاست و چەپ

بەسەر لاپەڕی ویژداندا، ڕادەکێشێ.

لەزۆر شوێنی ئەم دنیایە.باو ئاوایە .

تەکنەلۆژیا لەخزمەتی مرۆڤـدایە.

زۆر وادەبیَ،

کاتیَ لافاویَ هەڵدەستیَ ،هێرش دێنیَ.

مەترسی دیَ ،

گوندیَ،شاریَ،نیشتمانیَ..

وێرانبکا...بڕوخێنیَ.

کاربەدەستان ،دێن بەپەلە،

بە(شۆفەلْ)و(بیلدۆزەر)..یان،

بەر بەزیانی سـروشت دەگرن،

دەگەن بەفریای ئەوگەلە.

کەچی لێرە ...لەوڵاتی شەهیداندا.

لەنیشتیمانی بای مەرگ وڕاگۆێزاندا.

لەجیاتی کارمان ئاسان کەن.

جۆگا بۆمەزراو بێستان کەن .

بەربەست بۆچۆم وبەستان کەن.

هەرچی چاکەبوو...نەیان کرد .

خانوو وکەپری هەژارانیان..

پیَ روخاندوو،

وڵاتێکیان پێ و ێران کرد .

پێیان وتم :

لەپێش ڕپەڕین وشۆڕش،

ململانێ وبیری جیا جیا .

مرۆ ڤـــ لەتاریکی دەژیا .

بەڵام ئێستا لەسێبەری پێشکەوتن دا،

گەر بارانێ لێزمە بکا

گەر لافاوێ.. شەپۆل بێنێ.

گەر بورکانێك فیشقە بکا،

خەڵکێکی زۆربتۆقێنێ.

ئەگەرباهۆزێ هە ڵبکا ،

دارو دیــوار بڕوخێـنێ .

کاربەدەســتان دێن بەپەلە.

پۆل پۆل(کۆپـتەر)هە ڵدەستێـنن

دەگەن بـە هانای ئەوگەلـە.

منیش پرسیم:

ئەی بۆ لێرە،

لەو زێدەی کوردی لێ دەژێ .

بەشەو و رۆژ چۆن بپەرژێ .

( غەزال)ڕاوی( هەڵۆ )دەکا

( ئەلیوت )خوێنی گەل دەرێژێ.

لەڕێ ی کانی،لەچیلکەودار،

لەکنگرو لەڕێواسـان،لەبەر بژار،

کیژۆڵـەی ناسـك دەکوژێ...

بەسەر کارگەروسەپا ندا.

بەسەرشوان وبەرخەواندا.

بەسـەر ڕێبـوار و گاواندا...

بـارانی مـەرگ دابێـژی.

پێیان ووتم:

ئەم سەدەیە سەدەی ژیانە.

سەدەی مرۆڤی دەسکردوکۆمپیتەرو...

گەشتی ئەستێرەوئاسمانە.

سەدەی بینینی ژێرزەوی و..

دۆزیـنەوەی گەنج وکانە.

سەدەی دۆزینەوی نەوتە،

نەوتیش..بەرگە،ئاوە،نانە ...

منیش پرسیم:

خاکی ئێمە زێڕی ڕەشە..

ئەدی بۆچی،چاوچنۆکان لێناگەڕێن،

لەبرسان..دەمان مرێـنن.؟؟

بە مایەی  دزی و تالآنی،

بە(خەردەل).. دەمان خنکێـنن.

گەر تۆزقا لێك نووزەیش بکەین ،

هاوار یـشمان دەتـاسێـنن.

بناری قەندیل     ١٩٨٨

# لێبووردن

ئەدی مەگەرئێمە نەبووین

بووبوو بەویردی سەرزارمان

کۆرەنگ ⋆ لەژێر پێمان بڕوا،

جێ ی ناهێڵین؟.

ئەرێ نیوەی ئەم کۆمەڵە..

نەیان دەگووت:

دارەکەی بەرماڵان رەوکات ، قەت رەو ناکەین .

دەبێ لەخۆمان بپرسین

نسکۆ دوای نسکۆ یانێ چی ؟

ئەی ئەم جارە بۆ هەڵاتین؟.

دەبا ئەمڕۆ بۆ چەندبارە

کلاًفەی ژانی دێرینە هە ڵکەینەوە ،

با ئاوڕێك لەرابردوو بدەینەوە ،

ئەوە کێوی ورەی گەلمان

هێشتا بەرزە ، نەڕوخاوە .

ئەوە دەمی چەقۆی جەلاد

لەسەر ملی پیرو لاوان لانەبراوە ،.

خوێنی بەربووی شادەماری نیشتیمانم

،نەوەستاوە..

ئەریٚ..مەگەر ئێمەمانان ،

کوڕانی دوندی قەندیل و..

دەشتەکانی گەرمیان نەبووین.؟؟

مەگەر ئێمە ...

رۆڵەکانی بادینان و بارزان نەبووین ؟؟

بۆ چی هاتین ؟

بۆ پێم نالێن بۆ هەلاتین ؟.

شوورەیی یە ،

کوانیٚ (کوردستان یانەمان)،

کوا (نەسرەوتن تاسەرکەوتن)؟؟

مەگەرئێمە شۆڕشمان کردبۆ لێبووردن .

شوورەیی یە !..

لەئاست تاوانی (هەڵەبجە)..چاونوقاندن.

مێژوویەکە ..

گوڵی سووری تێکۆشانمان پێشێل دەکەن .

کەچی هەندیٚ ،لەئاستیدا خۆگێل دەکەن.

چی کەوشەنی نێوان هەبوو

بەزۆری زۆردار بەزاندیان .

هەرچی دەرگای ویژدان هەبوو

بەدەستی تاوان هەژاندیان .

ئای لەم چەرخە ..

ئەمە دادگای گورگ وبەرخە .

ئەوان هاتوون . .

سیمای جوانی نیشتیمانمان دەشێوێنن ..

خاکی بەپیت وئازیزمان داگیر دەکەن ،

دەسوو تێنن .

ئێستا ئێمەچەوساوەین و ...

لەسەر مافی خۆمان ســوورین .

دە خەڵکینە ویژدانتان بێ

دەبێ ئەوان بمان بوورن ؟

یان ئێمە لەوان ببوورین .*

ئۆردوگای دێڵزی ئەیلولی١٩٨٨

---

• ئەم شیعرەم لەوەلآمی لێبووردنێکی رژێم نووسی لەکاتێکدا کەچەندکەسێك داوای گەڕانەوەیان لە لە ئاوارەکان دەکرد...

## هەواڵێکی نهێنی

ئەی هەڤالاْن ..

کاتێ هەواڵم پێ گەیی

گورگەکانی نێو پێستی مەڕ.

سەگبەچەکانی دێوی شەڕ.

بەئاشکرا دەیانەوێ ،

لەگەڕەکی شارەکانمان.

لەگوندو هەوارەکانمان.دزی بکەن.

لەسەر پەڕەی رۆژنامەی دڵ.

زۆر بەتوندی،بەداخ وکوڵ.

بێزاری خۆمم دەربڕی.

لەسەر شەقامی هۆنراوە،

دروشمی قەهرو توڕەییم،

بەبازووی وشە..هەڵبڕی.

بەغدا ١٩٧٤

# داپیــره

من تائێستا چەن زستانێکم بینیوە .

بەلاّم هیچیان ،وەك زستانی ئاوارەیی ،

سەهۆلّ بەندان و..کرێوەوسەرما نەبوون .

من تائێستا..چەندهاوینێك ،

ماری تینی خۆرەتاویان ،

زامی جەستەمیان گازیوە.

بەلاّم هیچیان وەك هەناسەی دایکی شەهید،

پڕ لەگڕوگەرما نەبوون .

من پیرەمێردوپیرەژنم زۆرناسیوە .

بەلاّم هیچیان وەك داپیرەکەی ئۆردووگا

لە گێڕانەوەی ئەفسانەو کۆنە دیرۆك .

پەندی پێشینان وچیرۆك .

ئازا نەبوون .

بەيانى بوو  وتم : نە نە..

فەرموو ..گوێچكەم بۆ ڕست ڕستى

وشەكانت هەڵخستووە.

وەرە بەر بەرۆژكەى شيعرم

من وا لاپەڕەى دڵى خۆم

لەبەر دەمتا ڕاخستوە .

لەوساكەوە خولەك خولەك

زامەكانم دەكولێنەوە

چركەچركە..ئەم وشانەلەگوێچكەم دا

وەكو زەنگ دەزرينگێنەوە:

دەورانێ بوو

هە موو ساڵێ لە نەورۆزدا

لە داوێنى(قەرەچوغ)ى سەربەتۆزدا.

(پيرەمێرد)ێك چوست وچاپوك .

گورجوگۆڵ ومەردو لەش سوك.

گورزە دارێكى دەبەستاو .

هەڵى دەدايە سەر شانى .

(بەردەئەستێ)ووشكە( قاو)ى

دەخستە بەرك وگیرفانی .

منالأنیش وەك كورەهەنگ

دووی دەكەوتن بەگۆرانی.

بە كۆڵی شادی و هیواوە

دەچوون بەرەو لوتكەی بانی .

بەسەر پشتی تاوێرەوە .

بە بەر چاوی ئەستێرەوە .

پۆل پۆل ،

پشكۆی گڕی سوریان هەڵدە فڕاند.

لە دوای دامركانەوەی ئاگر

حەیرانێكی دڵتەزێنی

بەرەو قوببەی ئاسمانی شین

تێ دەچریكاند .

كەدوا بەندی تەواودەبوو

قەلونێكی دادەگیرساند .

ئارام ئارام هەڵی دەمژی و

منالەكانی دەدواند:

ڕۆڵەكانم ..!

دەزانن بۆ هەموو سا لێ...

بە ئاگری بیرەوەری

شەوی تاریك روناك دەكەین؟

خۆی لەخۆی دا وانەیەكەو

فێرتان دەكەین.

نەكەن بێڵن لەم قوڵەوە

جرجەكوێرە ..هێرش بێنن.

چونكە دوایی بەئاسانی جێی ناهێڵن..!!

من چیرۆكی گوێی ئاگردان

زۆرجار گوێچكەكەمیان سمیووە.

بەلاّم هیچیان وەك ئەمجارە

نەبووە بە پەندێكی مێژوو

لە ناخم دا نەچەسپیووە .

ئەوەتانێ....

ڕەو ڕەو ئۆردوو وخێڵەساتیان

سنوورەكان دەبەزینن.

كۆڵەكەی ڕشی ڕەشماڵیان

لەخاكەكەماندا دەچەقێن

ئای ئەمانە شۆفێنستن !

دوژمنی زەحمەتکێشان و....

چاوچنۆکی سەدەی بیستەم .

تادێ بەرەو پێش تاودەدەن .

بەوەی چەند ساڵە دزراوە،

تێر نەبوونە ،

هێشتا خاکمان بەناو دەدەن

(کانی دومەڵاَن) مۆڵگەیە ،

لە (چەمە دووبز) ی سوتاوم .

لە (شۆڕاو) م.

لە (شیرناو )م.

حوشتر و مەڕیان ئاو دەدەن .

لەمێژایە.لامان وایە..

هەموو چەوسانەوە و زۆرێك،.

ڕاپەڕینێکی لە دوایە.

ئەوەنیە ئێمەش بەشوێن پێ ی پیرەدا

کەوتووینەڕێ ،

گورزەداری کۆڵەپشتمان سەدخۆزگەیە .

ئا گرەكەمان...

گڕی دەدەم لولەی تفەنگی پێشەرگەیە .

ڕێگا:هەورازی مەینەتی ومالْوێرانی.

بەستەوحەیرانمان شیوەنن بۆ قوربانی.

بەلاْم...هێشتا زۆرمان ماوە .

گە لێكمان هەن:

گەلحۆن،پەستن .

زێڕو زیوی سولْتانەكان،

كوێری كردوون،

بەبادەی فیشالْ ودرۆ،

كەیلن،مەستن .

ولاْتیان ..خانی (دامە)یە،خۆیان داشن.

ئەوەی خاكیان داگیردەكا،

دەی پەرستن،

ویژان مردوون،سپلْەن ،جاشن.

ئەوا شیعرم دەكەم بەگوللەی گڕدار و

بەرو ڕوویان دەیتەقێنم.

ووشە..دەكەم بەڕەوەكۆترێكی سپی

بۆ ئاسمان..دەیان فڕێنم .

تا سبەینێ گشت لاوانی ولآتەکەم ،

ببن بە گڕ.

ببنە (مامەیارە)ی سەردەم

سروودەکەی (سا لێ تازە)بلێینەوە.

بە هەورازی مین ودڕکەزی وتەلبەندا

بەسەر کەون ...،

بەسەربەرزی ،

بەرەوشوێنی دێرینیان ،

بەشادی بگەڕێنەوە.

نەغەدە ١٩٨٩

## جەنگەڵ

لە هەندەران....

لەوبەرهێڵی سنوورەکان

لە کوچەو کۆڵانی شارێ.

دەنگێکی کزدەهات لەدوور:

شۆرەیی یە!

لە سەردەمی گەشتی گەردوون

رمانی قەلاّی زۆرداران.

بەرەو ئاشتی ویەکسانی چوون.

کەچی ئێمەی مرۆڤی کورد

وەك (کۆمەڵی سەرەتایی) !

لە ژێر ئەشکەوت و لەجەنگەڵ،

دەژین لەجێ ی وورچ ومەیموون.

شێخ بزێنی ١٩٨٨

# زامی بەسۆ

پێشکەشە بە شەهید غسان کەنەفانی

ڕەنجبەر..کەچاوی هەڵهێنا
بینی خاکەکەی لەت لەت وژێردەستەیە.
کە ڕاپەڕی...هۆشیار بۆوە
زانی گەلی،لەژێرباری چەوسانەوە،
زۆربەی وەکو مارگەستەیە.
کە پەلاماری چەکی دا
چەپکێ گوڵی ، شیعری ووتی:
فەرموون لە گلێنەی وشەوە،
تەماشای زامێکمان بکەن.
جا دەزانن ئازاری ئێمە لەکوێ یە،
کە خوێنشی،
تێکەڵ خوێنەکەی(غەسان)بوو
ڕەنگی سوور دنیای تێگەیاند
زامی بەسۆ..

لەهەرجێیەك بێت بەسۆیە.

ئەمڕۆ شیعری ئەم میللەتە(جگەرخوێن)ە

ڕێگادەگرێ بە(نزار)ێ:

سەرنج بدەن هەمووجارێ،

هەتا زەیتونێکتان دەسووتێ.

سەد داربەڕووی کوردستانم دێننەخوارێ !

سەرنج بدەن ،

ئێمەش( دڵمان لەگەڵتانە*) !

وا قژنێ..بار بەلێوێ.

دوورە ولاٌتێ،(پەشێو)ێ.

ئارام، ئارام شیعری کوردی

بۆ (محمود دەروێش) دەپێوی:

ئێمە لە شاشەی بەردەوە

لە ڕوانگەی برینەوە..

خەڵکی بێ ئالأدەبینین

ئەدی ئێوە لە ولاٌتی خۆتانەوە.

لە(تل زعتر)ی شەهیدو وێرانەوە

پێ دەزانن ؟؟ !

( شۆڤینیەکان لەکوردستان

هەرچی دەکەن !

زایۆنیەکان لە فەلەستین

کۆپی دەکەن.)

لە هەندەران ...

لە سەرشانۆی شیعری بەرگری میللەتان

شاعیرێکی دەربەدەری ولاتەکەم

شیعری دەکا،بەبروسکەی ئاوارەکان :

ئەی ئاوارەی فەلەستینی !

ئێمە لە چارەی دزێوو،

لە ڕەفتاری دووژمنانی خۆمانەوە،

تێگەیشتین لە زایۆنی.

فەرموون ،فەرموون،

لە(ئۆردوگای زۆرەملێ) میوانمان بن.

زیاتر شارەزای ژیانمان بن.

تا بزانن لەکەرکوك وخانەقین دا

لە(شەنگار)و لە(ماردین)دا

لە سەرانسەری ولأتی

ئازاروچەقۆ وبرین دا ..

چی ڕوویداوە.

هەربۆ بەلگە:

هەزاران گوندمان دزراوە !

لە جێ ی ناوە کوردییەکانیان

ناوی(قدس)و(حیفا)...یان لێ نراوە

۱۹۸۳بیرەسپان

---

* ئەودێڕە.. لەشیعرێکی شاعیری فەلەستینی محموود دەروێش وەرگیراوە.

# جۆلانه

لەنێوانی مەرگ وژیاندا،

چەوسانەوە...

بووەبەجۆلانەشرێك

وا رۆحی شەكەت وماندووم

رادەژێنێ.

میلی كاتژمێرەكەی دەستم ،

پێوەرێكە،چركە چركە

لەساڵنامەی كولەمەرگیم،

دەردەهێنێ.

من دڵنیام.. رۆژیك دادێ،

جگە سێبەری سەروەری.

تاڵی و سوێری.. بیرەوەری،

جگەلەتیشكی بەرگری

هیچ تارماییەك نامێنێ.

١٩٩٧سلێمانی

# دووهۆزان

**١- تاپۆ ....**

**هەندێ دەمرن**

**لە پاش خۆیان کۆشك وتەلار .**

**زێڕ ودۆلار .**

**ماشێن وبار...بەجێ دێڵن.**

**ئەدی ئەی من... ئەزیزانم ؟ !**

**هیچ شك نابەم جگە لە کتێبەکانم**

**مەگەر چەکەکەی شانم.**

**هەندێ دەمرن تاپۆی ڕەش و**

**شیکی بانك وزەوی وزاری زۆرجێ دێڵن .**

**ئەدی ئەی من... ئەزیزانم ؟ !**

**هیچ شك نابەم**

**جگە لە شیعرەکانم.**

**مەگەرخۆشەویستی گەل ونیشتیمانم .**

**١٩٨٧/٨/١ کاولەسوار**

٢

## ناشتن-

من پێم وابوو

له پاش مردن ونهمانم .

ههموو پاشماوهی ژیانم .

سامانم ، کتێبهکانم .

کۆڵهپشت ..، چهکهکهی شانم .

دهبنه یادگار بۆ خێزانم .

به لاّم ئهوهی بۆته گرێ لهسهردڵم ،

ههتادهمرم پهشیمانم ...

بهزیندوویی

بهم دهستانهی خۆم ناشتیانم* !

دێڵزێ ١٩٨٨

---

* بهر له ئهنفال کتێبخانهکهم کهپتر له( ١٥٠٠) کتێب وگۆڤاربوون لهناوچهی ( شێخ بزێنی) بهخاك سپارد ، بهداخهوه له ئهنفالی چواردا ئهوانیش تیاچوون..

# پرسیار ؟

پێم نالێن کێن...؟!

ئەوانەی وا لەبەردەمی سوڵتانەکان

سەمادەکەن ،هەڵدەتووتێن .

پێم نالێن کێن...؟!

ئەوانەی وا ...

گورگن لەنێو پێستی مەردا

گوایە شەو ڕۆژ دەسوتێن

چاوی گەلێ دەیان ناسێ ،

تەنیا لوێچی کاسە لێسن .

هەندیٚ خەڵکانی (ماستاوچی)و

دەست بڕو پیس و چڵێسن .

ئەگەر کەسێ پرسیار بکا

دڵدارانی ڕاستی لەکوێن ؟..

زوو پێی دەڵێین :

ئەوە بازوی ڕەگ ڕەگاوی

ئەوە زامی دەست وپەنجە... .

یەکە یەکە،

جمگەکان و بربرەی پشت..

هاوا ردەکەن :

بمان ناسن !

هاورێیانی عارەقە وخوێن،

کارگەو ئاسن .

تا بمێنین...وەك چەوساوە

لە بەرپێ ی کەس ملکەچ ناکەین

دوا ڕۆژیشمان لەبەرچاوە

١٩٨٧ چەمی ڕێزان

---

*لە کۆڕێکدا بۆ پێشمەرگەکانی تیپی ٢١ی کەرکوك و لەمزگەوتی گوندی(قوچەبلاٚخ) خوێندرایەوە.

# ئاگر باران

بەیانی بوو..

هێشتا قژی زێڕینی خۆر

بەگەردن وشان وملی گردوشاخدا

دانەهاتبوو.

هێشتا شوانی لەش سووکی دێ

نێو کەپنکی هەور وتەم دا

لە گەرمەی خەو هەڵنەستان بوو.

هێشتا ساوای برسی وهەژار

وەك نۆلاوی ژووری زیندان

سەراپا شەتەك درابوو.

هێشتا پیاوی بە ساڵاچوو...

فرمێسکی قین لە سەرپێڵوی چاوەکانی

قەتیس مابوو.

ئۆتۆنۆمی.. ئۆتۆنۆمی

نا نا (ڕۆکێت)،(بۆمبا)دیاری.

بەسەر گونددا..بەردی،داری.

وەك چكلێتی پێشوازی بووك.

وەك دەنكە سوورەی بەلالوك،

دا دەباری.

بەیانی بوو

ڕەو ڕەو قەلەڕەشكە هاتن

دەیانەویست...كۆتری سپی.

لە هێلانەی خۆشەویستی،بتارێنن.

دەیانەویست

لەگەڵ چیلكەوچرۆی داردا،

زەڕنە قوتە بسوتێنن.

دەیانەویست

لەگەڵ هەڵەشكی خانوودا،

لاشەی مرۆڤــ تێك بشكێنن.

لە پڕ یەك دوو(هەڵۆ)ی چاو تیژ

سێ ،چوار( باز)ێ

لە زۆزانەوە هاتبوون.

لە( گۆپتەپە)و لە(حاجی تان)

له(هەلاج)وسەری( دابان) ڕاهاتبوون.

خۆیان ئاسا..چونە مەیدان

لووتکە دەستی ڕادەکێشان

نشێو ئامێزی کردەوە

دار پشتی دانوواند بۆیان

هەربەردبوو دەبووە نیشانە

دووژمنی پێ نیشان دەدان

گوێت لە نرکەی ئەشکەوت دەبوو

کە دەینالأند.

بە کراسێکی خماوییەوە

دایکی شەهید... گازی دەکرد:

( هەتا زووە بچنە ئاسۆگە بۆ پارێز )!

خوشکی شەهید..لەبەردەمی سەنگەری گڕ

لوولەی تفمنگی سەرشان

لە پاڵ کاکی پێشمەرگەدا

ئامادەبوو لاشەی بکا بە مەتەرێز .

تا ئێوارە ..

( پیلاتۆز)ودالّی (ئەلیۆت)

دایان باراند مەرگ وبارووت

بەڵام (سەرباز)ی گەرمیان و

(هەڵۆ)ئازاكانی كوێستان.

لە ئاگر باران نەترسان

ئەمجارەش وەك (حەمك)و( ژاڵە) .

وەك(هەیدەربەگ)و(تەكباسان)

تۆماریان كردەوە داستان. ★

قەرەسالم ١٩٨٥

---

★ ئەم شیعرم هاوكات لەگەڵ پەلامارێكی رژێم بۆسەرگوندی (قەرەسالم) لەبەری كەركوك وگوندی (كانی سلێمانە) لەبەری هەولێرنووسیوە كە (باقی بارزانی) تێدا شەهیدبوو.

## بەردەباز

ئای چەند شیرین و پیرۆزە

ئەم ڕێبازە.

ئای چەند دڵگیرو ئازیزە

بیری تازە !!

گەر وانەبێ چۆن دەتوانیین ،

بگرین رێگای ئەم هەورازە .

ئەمە رێگای کاك ( شیهاب ) و

کاك(ئارام) و....

هەزارانی وەك( رێباز) ە

من دڵنیام ..

تەنیا هەرئەم توولەرێیە

بەردربازە!!

ئەیلولی١٩٩٦ بەردەشان

# ئامانج

کەباران بەخووڕدادەکا.

دەبینی رووبار هەڵدەستیٚ.

کەخاکیش تیٚنوویەتی دەشکیٚ

چووزەرەگیای نەرم وناسك

لە بن بەردیش دا ناوەستیٚ.

کە شاعیر نەرمە ژانی بیٚ

وەك ماران گاز گینگلٚ دەدا

ئارام ناگریٚ ،

هەتا شیعریٚك هەڵنەبەستیٚ.

منیش ..هیٚندە چەوسامەوە.

کەوتبووم و هەڵسامەوە.

لەو رۆژەوە..

کەقەڵەم وچەك بەدەستم .

هەرچەند ...دڵم بەئازارە .

چونکە ئامانجەکەم دیارە..

تا خویٚنم بجمیٚ...ناوەستم .

قۆجەبلاٚخ /١٩٨٧

## راپەڕین

گوندێك ....

لەنێو شەوەزەنگدا

تارماییەكیان بەدی كرد.

نیشتنە سەری،بەهەڵبڕین.

بەدەیان گوند ....

كەئەو هەواڵەیان زانی

لەئاستی خۆیان راپەڕین .

١٩٨٣

## ژیان

لەوساوەهەم ..

لەسای لووتكەو بنار ئەژێم .

هەروا ئەژێم .

لەو رۆژەوە پێم گرتووە،

رێم گرتووە.

ئیستایش لەرێم.

رێگای شاخ ١٩٨١

## چەوساوە

لەگوندێکی راپەڕیوی کوردستان دا،

چەند جوتیارێك.

لەدەست زۆرو چەویانەوە،

پەرێشان بووبوون..بەجارێك .

پردی ئارامیان پسابوو ،

دەست بەخەنجەر،

رێگایان گرتبوو لەسوارێك:

خوبزە ...خوبزە.

بڕۆبڕۆ بە (مام ئاغا) بڵێ

جەنابی گەر وا دەر دەخا

لەگەڵ ئەودان بەگ ومیر وشێخ وکوێخا،

با بزانێ..گشت کرێکارورەنجدەرانی ئەم دنیایە،

پاڵپشتی منی (مسکێن) ن.

رۆژێ هەردێ بڕبڕەی پشتی چەوسێنەر

دەدەن لەزەوی ودەیشکێنن .

١٩٨٣ شەوگێڕ

---

٭لەژمارە (٨) ی گۆڤاری بانگ دا بلاٌوکراوەتەوە.

# هەڵسانەوە

ئەمشەو

لەخەوما شەهیدێك،

لەگۆڕەکەی هەڵسایەوە،

کەهاتەوە.

لەهەڤالەکانی  پرسی:

کێ دەتوانێ وەڵامێکم بداتەوە :

کەقارەمانێك ئەم خاکە،

بەخوێنی خۆی ئاو دەدێرێ.

کێ دەزانێ

دڵی دۆست وئازیزانی ...

لەپاش خۆی،

بەکێ دەسپێرێ ؟؟.

١٩٨٣

## هۆرە

رۆژی سەدان لاو..لەقەسابخانە.

بکەن بەدارا ،یا بەنیشانە.

رۆژی دەیان پیر..ئاوارەی خوار کەن.

ژێر پێ ی زیندانی ..پڕ لەبزمار  کەن.

دەستی ئەم گەلە،دەگات بەوخۆرە.

بەسەدان ساڵە..،بۆی دەکات هۆرە.

١٩٧٤

## تۆڵە

تۆڵەم لەزۆردار..بسێنە ئەی خوا.

ماڵی بردووم بێ پەروا .. ئەیخوا.

بێ شەرم لەتۆ،  پێم دەڵێ:ئەیخۆم.

کەئەو،ماڵم خوا،

ئە ی خ وا ..ئەی خ ۆ م.

١٩٧٤ سەرگەڵو

# ئالاَ

کەبۆ بالاَی کۆشکێکی رازاوەم روانی.

خشتەکانی...

کاسە سەری هەژاروچەوساوەکان بوو.

کەزیاتر لێی وردبوومەوە ،

دیکۆری رەنگینیم بینی ،

زۆرباش زانیم ،

بەفرمێسك وخوێنی مژراو..

دامەزرابوو.

لەسایەی دا ..هەلَوەستەم کرد

زەحمەتکێشێك دۆش دامابوو.

منیش هۆشیارم کردەوە،

ئۆرگانێکم دایە دەستی ..

تیانووسرابوو:

( ...رۆژێ دادێ

بومەلەرزەی ڤینی پیرۆز..

بورکان وبازووی رەنجدەران،

کۆشك وقەڵای ستەمکاران،دەڕوخێنن،

چەوساوەکان ..لەشوێنەکەی

بەهەشتی بەختیاری مرۆڤـ...

پێك دەهێنن.)

ئەویش وتی :

باساڕێژ بێت ئەو برینەی

لەرۆحمدا هەڵکەندراوە.

بۆ سەر ئێسکان شۆڕبۆتەوە،

وەکو خۆرە،وەك تیراوە.

دەبا  هەردەم شەکاوەبێت،

ئەو ئاڵایەی بەخوێنی

شەهیدەکانمان...نەخشێندراوە

١٩٨٧چەمی ڕێزان

## پەریشانی

بەمناڵی..
لەتەمەنی هەشت نۆساڵی.
کاتێ روانیم ،زۆرباش زانیم .
ژیان وەك دۆزەخێك تاریك بوو.
سەیرێکی بەر ماڵانم کرد،
رچێکی چەوت وباریك بوو.
سەرم هەڵبڕی بۆ تکا.
بەسەدان جار دڵم شکا.
خۆم نێوشاڵاوی ئاگرو ...
لەژێر سێبەری دووکەڵ دی.
رەورەوەی بەخت وتەمەنم..
زۆر پەشێو و پەلەپەل دی.
دێوی ڕەشی فاشیستەکان،
دەیان ڕانی.
بۆنێو جەرگەی پەریشانی.

١٩٧٤بەغدا

## جەژنانە ⋆

ئەی هەڤالاًن ..

قەت پیًم مەلیًن ( پیرۆزە) .

کەرپیشەی دلً لەداخاندا ئالۆزە .

جەژنە..ناکەم،چونکە دلًم غەمگینە.

هیچ بەجەژنەی نازانم،ماتەمینە

سالاًن...خەلًکی،

لەرۆژی جەژنە شادبوون.

لەبۆ سەیران ،

لەکوردستان ..ئازادبوون.

کەچی ئەمسالً،

لەجیً ی سەیران ماتەمە.

سەران سەری نیشتمان

هەورو تەمە...

جەژنی قوربانی١٩٧٤بەرگەلًوو

---

⋆ ئەم شیعرە لەئەنجامی بیستنی تراژیدیایەکی دلًتەزیًن.. بووبە جەژنانەی هەڤالًە کانم. هەر ئەورۆژەیش،لە(تایپ)ی(هیًزی ڕزگاری) چاپ وبلاًوکرایەوە.

⋆⋆ لە ژمارە (٩)یگۆڤاری شەهیدلەنەورۆزی ٢٠٠٠ دابلاًوکراوەتەوە

## تــانه ⋆

کچێك . لەبەر دەرگای دادگای ،
مافی ڕوای خۆی..وەستابوو.
هاواری کرد :
لاوی لەبار،کۆشك وتەلار
بەزمی نێوشار،
گەشتی دیهات.
سوار بوونی (تویێتا)و(فیات).
چی ترهەیە . هەتا ماوم
نابن ،بەتانەی سەر چاوم.
لێم ون ناکەن ،
کەسوور دیارە.
بەقەد سەر نووکی دەرزییەك،
چی تاوانی ..تاوانبارە.

١٩٨٣ / وەرتێ

⋆لەگۆڤاری ( را پەڕین) ژمارە ٢ خوولی ٢ ساڵی ١٩٨٣ دا بلاۆکراوەتەوە ـ

## دوو پیرەمێرد

پیشکەشە بەشەهید ( نازمی حمەی سلێمان) و بە ( مام شۆڕش ) بیرەسپانی

دووپیرەمێردی برای چەك .

لەنێو قەدی هەورازێك دا،

گەیین بەیەك .

لێكیان پرسی ،

دووهەڤالی ڕێ ی تێكۆشان.

بەو تەمەنە ..

چۆن توانییان،

چەكی بەرگری نیشتمان ،

بكەنە شان .

یەكەم وتی:

من بۆیە سەری خۆم هەلگرت،

چوونكە سەرم

لە( هندرێن )بەرز تربوو.

داگیر کەران دەیانەویست .

لەدوواچارەکی سەدەی بیست .

بەقاشۆی (شەق)بیکەن بە(گۆ)

چۆن دانیشم ..دەستەو ئەژنۆ.

ئەدی ئەی تۆ ...؟

دووەم وتی:منیش بۆیە

ئەم کەوشانەم کردۆتەپێ.

دڕ بە هەوری ترس دەدەم،

بەرەو قەندیلی بەرخۆدان،

کەوتوومە ڕێ .

چونکە زۆرداران دەیان ویست.

لەدواچارەکی سەدەی بیست.

دەستم لەبازنەی کەلەپچەو

پێم لەکۆت وپێوەن دا بێ.

بناری پیرەمەگرون١٩٨٨

# ماڵوێرانی

دەگێڕنەوە..

لەگوندێکی داوێنی چیا،

لەگەرمێنێ .

لە( ئاغا ) وە هەتا دەگا بە( مسكێن ) ێ.

هەرهەموویان ...

دەبنە نیزەی سەرەڕمی داگیرکەرێ.

بێباك لەوەی ماڵی خەڵکی وێران دەکرێ...

بەلاّم خۆیان بەرزەك بانان،بچنە دەرێ.

کەچی کاتێ چاو هەڵدێنن ،چی دەبینن...

کەڵبەی تیژی (بیلدۆزەر)ێ.

ماڵ بەماڵیان وێران دەکات،

کۆشکی کارتۆنی ئاواتیان دەڕوخێنێ.

کەتەپوتۆزیش وەك هەور

بەری ڕووناکی هەتاووئاسمان دەگرێ،

چەند زەرنەقوتەی نەرم ونۆڵ...

لەهێلانەی گەرم وگوڕدا،دەخنکێنێ.

بە بەرچاوی هەمووانەوە ،

چۆلەکەیەکی بەهەڵۆێست ،

ئەو سنووری بێدەنگییە دەشکێنێ.

دەچیتە سەرسوپای دوژمن،

لەسەرسەری فەرماندەوە،

دێت ودەچێت،

بە ڕقەوە دەجریوێنێ.

⋆ ⋆ ⋆

دەگێڕنەوە..

لەگوندێکی وێران کراو،لەگەڕکێ.

لەپاڵ کەلاوە روخاوێ ،دێڵە سەگێ.

لەژێر کۆلیتە رماوێ ،سەر دەردێنێ.

گووجیلە شیر مژەکانی ،

لەژێر زنجیر دا دەبینێ.

بەبەر چاوی چەندجاشەوە ،

سێ چوار جارێ ،دەنووسکێنی،

چی تر خۆی بۆ ڕاناگیرێ،

بەهەڵپەیەك..فەرماندەکە دەتۆقێنێ.

سێ چوار جار پەلامار دەدات .

تادەیکوژن  واز ناهێنێ .

* * *

دەگێڕنەوە ..

لەگوندێکی داگیرکراو هەنگەلانێ.

لەگەڵ دیزەو گۆزەی ماڵێ ،لە دالانێ.

شۆفەڵ وردو خاشیان دەکات ،

دەبێت بەهۆی ورووژانێ.

ڕەوە هەنگێ تووڕە دەبن ،

هێرش دەبەن، دانامێنن .

چزووی تۆڵە ، دەچەقێنن .

* **

ئەی خەڵکینە ...!

ئەوەی ئێستا ،

جێ ی پرسیارو..سەرسووڕمانە،

دەبێ هەمووی بڵێین یەك یەك .

دوا دیواری وشكەكەڵك ..

دووا خشتی خوێندنگاو مزگەوت .

بوون بەكەپەك.

نەزنجیر پسا ...بەنزا ،

نە مرۆڤێكیش لەوگوندە هەستی بزوا ،

وەكوپیاوێكی بەئەمەك.

لەسەنگەری برگری دا

دەست داتە چەك .

بناری قەندیل ١٩٨٩

## قەڵەم فرۆش

ئەی ئەوانەی لەشێنەیی..

خۆتان بە کەڵە شاعیری

خاکی لەت لەت ، پێناس دەکرد.

ئەی ئەوانەی ..لەژێر نووکی ،

زەختەی سانسۆڕی بێ مۆڵەت

شیعرتان دەکرد بە بەنج و.....

سەری هەزاران هەزارتان،پێ کاس دەکرد.

ئەی بۆ کاتێ،بەرانبەربە زوڵمی زۆردار.

دارو بەردیش ،هاتنە گوفتار.

کەچی ئێوە ،لەبەردەمی تەختی سوڵتان.

لەسای کۆشك ودیوانی خان،

دۆش دامان وکەچ بوو ملتان.

تەنیا و تەنیا.....

بۆ ئافەرینێکی درۆودوو تیکەنان ؟؟!

١٩٨٦ دەشتی کۆیە

# ترس

دوێنێ..شاعیرێکی باش بووی.

نەیاری قەڵەمی جاش بووی.

شیعرەکانت وەکوباروووت..

خۆت بزێو و دەم هەراش بووی.

دەیان لاوت لەخەو هەڵسان

رێگای شاخیان گرتەبەرو..

بوون بەپێشمەرگەی کوردستان.

ئەی خێرەخۆت بویتە سەربازی( قادسیە)و..

سوپای ئەنفال..؟؟

من دەترسم رۆژێ دابێ

ببیت بە خاوەن گۆڤار ودەزگای هەواڵ.

ئێمەمانان بێینە دەرگات..

جەنابت ..دەرمانکەی بەپاڵ.

١٩٨٧

## دیاری

مناڵەکان .. وەرن ، وەرن..!

هەموودیاری خۆتان بـەرن.

دیارییەکەمان..هۆنـراوەیـە.

پێشکەش ئێوەی چەوساوەیە.

ئێوە پێشمەرگەتان دیـــوە .؟

لەڕووی زۆردارچۆن چەقییوە؟

چـەکی بەرگری لــە دەستە.

رزگاری گەلی مەبــەســتە .

بـــــەلاّم دژمنی درِنــد ە .

بەلاّی شــارو شـاخ وگوندە .

خەبات... بـۆرزگـاری گەلە

بژی (یـەکێتی) و (کۆمەڵـە)★

١٩٨٢ بناری خاڵخالاّن

---

★ئەم شیعرە بەر لەئەنفال لەزۆربەی قوتابخانەکانی شۆڕش

لەسنووری تیپی ٢١ ی کەرکوك لەلایەن منالاّنەوە دەخوێندرایەوە..

داستانی ساتی

ئەمشەویش وەك دوێنیٚ شەویٚ.

لەبلٚند بلٚندی شاخەوە،

چاو دەبڕمە چاوی ئاسۆ.

تا ببینم چۆن لەدوای تۆ.

ئەستێرە لەدوای ئەستێرە دادەکەویٚ.

بۆ سبەینیٚ گەلیٚ خێراتر لەدوێنیٚ.

بەدیداری چەوساوەکان شاد دەبمەوە.

باسی داستانەکەی ( ساتی ) و....

بوخچەی دلٚم  دەکەمەوە.

پێیان دەلٚێم :

فەرموون  ئەوە بیلبیلەی چاو،

وەکوکوتالٚێکی ڕەنگین،

خوێنین بووە

دەرگای سینە دەکەمەوە،

جەرگی کون کون با ببینن،

سۆبای کۆنیان بیر دێنمەوە.

کۆنەبرینیان دەکولێنمەوە.

ئەڵێم: فەرموون ..!

سەر بەم ئاگردانەدا بکەن !

ئەوا شـــیعر..قوڵپ دەدا،

وەکو مەنجەڵی سەرئاگر.

دەزانن بۆ..؟

چونکە دیدەم(شاهۆ)یەکی لێوەدیارە

لەئاسمانی (شۆڕیجە)وە دێتەخوارێ.

باڵەکانی ماڵئاوایی لەشار دەکەن،

هەموو کەرکوك چاویان لێ یە

(گزنگ ) لەنیگای دەبارێ.

چونکەدیدەم لەئاسۆی(خاڵخالآن)ەوە،

هەتا ( حەمرین )..

گرێکی سووری لێ دیارە،

لەباوەشی ئاسمانی شین لەپ دەکوتێ.

باباگوڕگوڕی  ئازیزە ،

ئاگر بەربۆتە دەروونی

قرچەی جەرگی دێ دەسووتێ.

* * *

ئەی شارەکەی ( ئەسیری )کورد

بەخوشکانم بڵێ چی تر،

ڕەش نەپۆشن.

خۆرلەزەردە ، بچنە سەربان ،

تەماشاکەن (کونەکۆتر)

چۆن هەناسە هەڵدەکێشێ

( قەرەچوغ )و( زورگەزراو )

بوونەتەوە بەشوێنی ڕاو.

هەتا (حەمرین)

لەتاواناجەرگی دێشێ.

* * *

ئەی شارەکەی (دڵسۆز)ی کورد

بەغەمخۆران بڵێ چی تر،

باشەربەتی غەم نەنۆشن .

با بەرگی پرسە..نەپۆشن .

چونکە قەتارەکەی (ڕیشە)

لەبنار (جەول بۆر)ەوە.

سروودەکەی(سەیدبرایم)

لەکەناری (چەمبۆر)ەوە.

بانگتان دەکەن :

بەشوێن پێ ی تفەنگ دا وەرن،

خوێنمان ،ڕێبازمان..

وون مەکەن .

ئەی شارەکەی (شەفەق)ی نوێ

لەدانیشتووانی(چیمەن ) ت

پرسیاربکە:

ڕووناکیتان لێوە دیارە ؟

پێیان بڵێ:

ئەوە تیشكی هەتاو نی یە،

لەودیوی كەلی (یاروەلی) یەوە

ئەوە(بلاجكتۆر)نی یە،

لەپشت ماڵانی(ئازادی )

تەماشاكەن..!

ئەوا بان (شوان) گڕی گرتووە

(ساتی) ...بۆتە ( قەڵای دمدم )

نەك داروبەرد..

هەتا ئاسنیش دەسووتێ.

* * *

ئەی شارەكەی شەقام دیل و...

دەرگای حەوشە مۆركراوم !.

گرمە گرمە ..؟؟.

ئەوە دەنگی دهۆڵ نی یە .

ئەوە مەیدانی مەشقەكەی

لای قزلْقایەی چۆلْ نی یە.

ئەوە دوورە،دوورە،دوورە.

ئەوە تەپلْی (بی،کەی،سی)

(هیوارِەش) وهاورِیْکانی یە،

لەقەد پالْی (شیوەسوور) ە .

روو لە(قازان) و(مۆردخوادە )

خوشکە(شوشە)

تەپلْی سینگیان بۆدەکوتی.

★ ★ ★

ئەی شارەکەی برین وخویْ.

کە بەزیویْك... دژت دەدویْ .

پیْ لەجەرگی تویْ تویْت دەنیْ،

تۆ پیْی بلْیْ :

ئەی ئەوانەی سەری شۆرِتان ،

بردەوە بەرپیْ ی شاوسولْتان .

دەك نەفرەتی گەلتان لیْ بیْ .!

بریا بەچاوی نەرمەوە دەتان بینی،

شەهیدەکان چەندبەرێزن،

چۆن دەخرێنە سەرسەر و شان.

وێنەکانیان ،وەکونیشانەی نەمری،

وەك وێنەی گەورەو سەرۆکیان،

داوە لەسینەو بەرۆکیان .

* * *

ئەی شارەکەی( زێڕی ڕەش ) م.

کە.. ڕوخاویٚ...

کەترسنۆکیٚ،دۆڕاویٚ،

لەشەقامی ژێر پیٚ ی چاودا،

هەنگاو داویٚ.

پیٚ یان بلٚیٚ : ئەی ئەوانەی

دە ستتان چووەخوێنی خۆتان،

نەفرەتی میللەتتان لیٚ بێت..!

بڕۆن..گویٚ لە( ئیزگە..)بگرن.!

تا بزانن ..

بەملی وەکوکەوان و،

بەجووتێ چاوی مۆنەوە .

ئەوانەی وێردی زاریان بوو :

((کەم دەژین وکەڵ دەژین ))

بەڵێنی خۆیان بردەسەر ،

ئەگەر بێت و شەهیدیش بن،

لە خاکی ئازاد  دەنێژرێن

تا کوردستان رزگار نەبێت

ناڕۆنەوە، ناڕۆنەوە ،ناڕۆنەوە...

ئەیلولی ١٩٨٥

---

٭ شاهۆ  فەرماندەی کەرت بوو لە تیپی٢١ ی کەرکوک لەنەبەردێکدا بۆبەرگری لەپەلاماری هێزەکانی رژێم بۆسەر گوندی ( ساتی) لەگەڵ خوشکێك دا شەهید بوون.

# خاك

لەسەر ئارمگای شەهیدێك،

هۆنراوەیەك ..

هە ڵواسرابوو.

کەخوێندمەوە،

وانووسرابوو:

هێندەئەم خاکەپاکەم ..

خۆش دەویست

لەپێناویدا دەبمەوە بەخاك .

بۆبنەبڕی تۆی چەوسانەوە

درێغیم نەکرد

لەدزی ناپاك.

١٩٨٢

# وەرزێکی نوێ

بۆشەهیدی نەمرجلیل صادق (حاجی هەڵمەت)

سەرەتای وەرزێکی نوێ بوو.

هێشتا پشکۆی خاکی تەزیو

نەکەوتبوو.

هێشتا ڕقی زریان وتۆف وکرێوە،

نەسرەوتبوو.

هێشتا هۆبەی بازی بێریان ،

دەوارێکیان هەڵنەدابوو.

بەهەزاران ئەستێرەی سوور،

بوون بەنەخشی سەرکاشانی،تێکۆشانم.

بوون بەرەمزی،ڕاپەڕین وکۆڵنەدانم .

لەگەڵ یەکەم چەخماخەدا،

لەسەرسینەی تەوارێکی رۆژهەلاتم،

گوڵێك پشكووت .

(گوڵە) بووبەهەتوانی زامی(زەكیەئەلكان )

بووبە هەناسەی (لەیلا)خان.

گەیشتە لووتكەی هەڵەمووت .

★ ★ ★

سەرەتای وەرزێكی نوێ بوو.

(زەڵێ) و (ناوزەنگ)

پێیەكیان هەرلە(شێنێ) بوو.

( چەكوچ )و( سادر)،

لەگەڵ قوتەی (مامەندە)دا

چاویان لێ بوو.

لە(بلەكێ)وە لافاوێك هاتەخوارێ.

بەرەو(سیروان).

بەرەو(ئەزمەڕ)و(خاڵخالاڵن).

بەرەو لای(حەمرین)لەڕێ بوو.

سەنادیدە بەزیوەكان.

گۆڕهەڵکەنە تۆقیوەکان

لەقوڕی شەرمەزاریدا دەتلانەوە .

لەوکاتەدا،

(حاجیلە)ی کۆت وبەندکراو،

گەردنی بلوورینی شاخی،

زەندومەچەکی هەورازوکەندولەندی

تەوقی دیلیان پساندو

لەسندمی (مۆڵگە)و (ڕەببیە)کرانەوە

★ ★ ★

سەرەتای وەرزێکی نوێ بوو.

چێشتەنگاوی شەشی سێ بوو.

لەبڵندگۆی مزگەوتەکەی(دەروازە)وە

من و(شێواو)..گوێمان لێ بوو.

( عەلی نەبی ) سروودێکی دەخوێندەوە :

سۆران..چاوگەی بەرخۆدانە.

بتوێن ..دەروازەی ڕاپەڕین.

**سلێمانی ..شاری هەڵمەت وقوربانی ،**

**واخەریکی خۆسازدانە .**

**لەپاڵ ( بەردەقارەمان) دا**

**زەماوەندی سەرهەڵدانە.**

**سبەینێ نۆرەی (گەرمیان) دێ.**

**لەدوای هەولێری منارە.**

**لەدوای (دهۆك)ی خۆڕاگر...**

**سەرانسەری کوردستانە.**

**من دڵنیام ..**

**تاجەگوڵینەی سەرکەوتن..،**

**لەسەرقەڵای(کەرکووك)دەنرێ.**

**مزگێنی بێ (مامەڕیشە)**

**موژدە ئەی (کۆمیتەی ئاگر)**

**نیشتیمانم دۆزەخی داگیرکەرانە.**

**سەرەتای وەرزێکی نوێ بوو.**

**(خاڵەبەخە)و(سەرکەوت)و**

(نەهرۆقەسرۆکی ).

رۆحی هەرسێکیان لەوێ بوو.

لە( قادراوا )پاچی جوتیاری راپەڕیو.

گۆڕی مەرگی چەوسێنەری هەڵدەکەنی.

لەگەڵ گرمەی تۆپ ودۆشکا.

دایکی شەهید،خوشکی شەهید،

دیسان دڵیان ڕادەچەنی.

(کێوەڕەش)سەرچۆپی گرتبوو.

(ئاسۆس) لەگەرمەی زەماوەند.

تاوێك لەخۆشیدا دەگریا ..

تاوێکی تر پێدەکەنی...

★ ★ ★

سەرەتای وەرزێکی نوێ بوو.

روحیانەتی (مەلای گەورە )...

چاوی لێ بوو.

کوڕانی (دەشتی هەولێر)و(باباگوڕگوڕ)

نەوەکانی(حاجی قادر)
بەنێوانی(چنارۆك)و(میرسەید)دا،
تیژ تێپەڕین.
چوونەکۆڵی (هەیبەت سوڵتان)
باوەجی..
بووبەنهێنی وبەناونیشان.
(بەفری قەندییان)
یەك یەك پەلی ڕادەکێشان.
(جەعفەر)وتی:
با(جەوهەر)تان لەگەڵدابێ
جەوهەر..جەوهەری دەبان بوو.
جەوهەر..بەگورجی(شەماڵ)بوو.
بەئازایی کاك(خالید)بوو
وەکو(سەرباز)قارەمان بوو.
جەوهەر..
وەك (ئەحمەدقەمبەری)و

(ئازادی حەمەی گەمحان) بوو.

جەوهەر  وەك (سالارەسوور)بوو

تفەنگەکەی (شەهریار)ی لەسەرشان بوو.

هەر ئەو شەوە..

لەپاڵ دیوارەکەی ( قشڵە)

خوێنی سووری بوو بە تۆفان.

بوو بە هێزو وزە وتەکان.

تەخت وبەختی زۆردارانی

لە ڕەگ وڕیشە هەڵتەکان .

★ ★ ★

سەرەتای وەرزێکی نوێ بوو .

(کۆسرەت )و(سەفین )پێکەوە،

( دێدەوان )یش ئاگای لێ بوو.

( قەڵا ) مزگێنی ڕزگاری

(پایتەختی هاوینە )ی پێ بوو.

لە(کەسنەزان)

چەند تانگێکی دوژمنی ساویلکەو نەزان

هەر کە لەجادە.. ترازان .

وەکو کیسەڵ،

چۆن بخزێتەکۆنەچاڵان،

کەوتنە بەر دەستی منداڵان.

هەر ئەو ڕۆژە..

پەیکەری کارتۆنی ڕوخا،

لەبڵندگۆی مزگەوتەکەی (خانەقا)وە،

لەسەر(منارەی چۆڵی)یەوە،

جاڕی ڕزگاری شارماندا،

بڵند بوو، ئاڵای شەکاوە

تەوار... ( داڵ ) ی هێنا خوارێ،

لەگەڵ هەواڵی سەرکەوتن

تاجی سەروەری ئەم شارەش ،

نرایە سەر (خەجە باوە).

★ ★ ★

سەرەتای وەرزێکی نوێ بوو.

هۆزانێکی (بەرەنگاری)م،

بروسکەیەکی بەپەلەی،

بۆمەکۆی(بروسك ) پێ بوو.

کێ دەزانێ لەوکاتەدا،

رۆحیانەتی(حەکیم حەمەڕەش)

لەکوێ بوو.؟

(مامەپیرە)گێڕایەوە:

ئاوارەکان..لەئۆردوگاولەشارەکان .

موژدەی سەرکەوتنیان پێ بوو.

(حاجی هەڵمەت)چۆن جارانی،

بەگڕی سوور..

هەوری ڕەشی شەقار دەکرد.

ئەمجارەیشیان چاوم لێ بوو

لەگەڵ شەپۆلی میللەتدا

شێخی چۆلی رزگار دەکرد...

ئەمجارەیشیان،

لەگەڵ لاوە عگیدەکان،

لەگەڵ پیرە ڕەشیدەکان،

لەگەڵ خزم وکەسوکاری شەهیدەکان.

تفەنگی تۆڵەی سوار دەکرد.

★ ★ ★

سەرەتای وەرزێکی نوێ بوو.

(بنەسەراوە)..ئاگردانی ڕاپەڕین و،

مەکۆی(سرك)و(بروسك)ی لێ بوو.

ئێوارە بوو..

شانە ،شانە، ...کۆبوینەوە.

هەرپێشمەرگەوچەندنوردێك نان .

لەگەڵ پشتێن وفیشەکدان.

شەتەك دران.

بەڕێ کەوتین..بەرەو مەبەست.

لەگەڵ گڕی(بابەگوڕگوڕ)،

لەگەڵ(کانی دوومەلآن )دا پەیمانمان بەست.

هەر ئەوشەوە ،

سەدان پێشمەرگەلەرێ بوون.

رۆحیانەتی (مەلائاراس)و(مام برایم)..

لە(هۆکاشە)چاوەرێ بوون.

(تەپە)وەك جاران بەئاگا..نەنووستبوو.

(رەحیم ئاوا)...

تەنووری مەرگی داگیرکەری داخستبوو.

بۆیە منیش لەسەر(کەلی یاروەلی)یەوە

هاوارم کرد: هۆهۆ مێژووی پڕشانازی.

دیسان موژدە!.مووژدەبۆخەڵکی بارمتە ،

بۆکەس وکاری(ئەنفال )وبۆزیندانی.

پیرۆزبێ واجارێکی تر

(کەرکووك)ی قیبلەی کوردستان.

دێتەوە ئامێزی دایکی نیشتیمانی.

★ ★ ★

سەرەتای وەرزێکی نوێ بوو.

بەرلەنەورۆز

(ئەسیری) لە(شێخ محی الدین)بوو.

موژدەی رزگاری (شۆراو)و

(سێکانی)و(بەرتەکیە)ی پێ بوو.

ئیتر رۆحیانەتی پاکی،

شیعرەکانی،

بوون بەسروود،

بوون بەمارشی گڕێکی سوور.

شار .. ڕاپەڕی،

ئالأی(کۆمیتەی ئاگر)یش شەکایەوە.

چەپکەگوڵی سەرکەوتنیش ،

لەسەر سەری بەرزی قەلأنرایەوە.

لەبەر ڕوناکی ئاگری ئەو نەورۆزە،

دیسان مێژوو بەخوێنی سوور نوسرایەوە.

★ ★ ★

**سەرەتای وەرزێکی نوێ بوو**

**(مەلای لالۆ) لەتۆبزاوا چاوی لێ بوو.**

**سەدان گەوجی زراوتۆقیو،**

**لە(حەمرین)ە وەئاودیو بوون ،بەرەو ئەودیو.**

**تەرمی(حاجی)یش بۆ(بیبانی)گەڕایەوە.**

**ئەم بەهارە بۆیەبەهارێکی کورت بوو،**

**دیسان ڕەشەبا هەڵی کرد،**

**نێرگزەجاڕو(چیمەن)ی کردبەخەزان .**

**لەوکاتەدا..شیعرێکی نوێ بووبەداستان.**

**بووبەڕۆمانێکی گەورە،**

**بەشاکارێکی مەزن وبەمێژوویەکی کەلگەت.**

**خەڵکی(کەرکووك)ی ڕاپەڕیوو،**

**پێشمەرگەکانی(بروسك)..**

**هەمووناویان لێنا (هەڵمەت )⋆**

**١٩٩٢ رانیه**

---

⋆لەساڵی ١٩٩٢لەبیرەوەری ڕاپەڕین دا لەشاری‌رانیەو لە١٩٩٩
لسەرپەیکەری‌شەهیدحاجی هەڵمەت لەشاری هەولێرپێشکەش کرا

ئێوارەبوو،خۆرلەزەردە.

خوشکە(بەیان)م پێ ی وتم :

هەر ئێستاکە ..

گوێم لەنرکەی دروشمێك بوو

لەدوورەوە.

گوێم لەزریکەی هاوارێك بوو

لە (دیاربەکر)ی باکورەوە :

.من دەبمە قوربانی گەلم ،

بەکراسی گڕی سوورەوە .

من کچە کوردم ،چەوساوەم....،

من هەرگیز ترس ناناسم.

دەبمە کۆترو هەڵدەفڕم ،

تا لەوەرزی خۆشەویستی

تا لەئاسمانی نەمری،

بچمە ڕیزی ( لەیلا قاسم )

١٩٩٠/٤/١ نەغەدە

---

*ئەم هۆزانە لەگەڵ بلاّوبوونەوەی هەواڵی شەهیدبوونی کچە کوردی باکوری کوردســتان ( زەکیەئالکان) دا نووسیم و لە گۆڤاری (کرمانج) بلاّوم کردەوە.

# بورکان ⋆

(١)

ئەمشەو لەخەوما شەهیدێك،

لەگۆڕەکەی هەڵسایەوە،

کەهاتەوە.

لەهەڤالآنی  پرسیاری کرد:

کێ دەتوانێ وڵامێکم بداتەوە ،

کەقارەمانێك ئەم خاکە،

بەخوێنی خۆی ئاو دەدێرێ.

کێ دەزانێ دڵی دۆست وئازیزانی ،

لەپاش خۆی،

بەکێ دەسپێرێ؟؟.

١٩٨٣

---

⋆شەهید ( بکرعزیز)  کۆیی رۆژی ١٩٨٦/٩/٢لەشەڕەکانی(قەیوان-ماوەت)شەهیدکرا،

لە  ١٣ /١٩٨٦/٩ لەچلەکەیدا لەگوندی(قازبەگیان)ئەم دووچەپکەشیعرەم پێشکەش کرد.

**(٢)**

**لەولای کۆڕەنگ**

**لەپاڵ قەیوان**

**( کانی گەوەڕە) م بەچاو دی**

**فرمێسکی لەچاو دەچۆڕان..**

**پرسیم:**

**تۆبۆکێ دەگریێی؟**

**وتی لای خەمزە و دووبرا**

**(مام برایم) کاروانێکی خستە ڕێگا**

**لەم قۆڵەوە،**

**لەپێش پێشی هەموانەوە**

**کوڕێکی دی (حاجی قادر)**

**کاکە( بەکر ) بوو بەچرا.**

**١٩٨٦/١٠/١٣**

**قازبەگیان**



# مەرگی هەڵۆ

**بۆچلەی شەهیدکاکەمەد حەمەصاڵح ناسراوبە ( خاڵەبەخە ) و هاوڕێکانی**

زەڵێ .. ئەی قەڵاکەی دوێنێم،

ئەی مەکۆی ئەمڕۆ وسبەینێم!!.

بەبیرت دێ..؟

ئەوسای شیعرێکی ئاوارەم

بووبەمیوانی دیوانی

چەندتاشە بەرد و دەوەنێ.

هەڵۆکەی خاڵخاڵان وتی:

من لێرە ئۆقرەناگرم،

پەلی تفەنگێکم دەنێ.

هەرعاشقەکەی جارانم..،

دەرۆمەوە بۆمەفتەنێ.

★★★

قەندیل ئەی هەواری شۆرشی نوێ

بەخۆراگری(سادر)

بەسەربڵندی (چەکوچ) سوێندت دەدەم،

بەبیرت دێ....؟

ئەوسای شیعرێکی یاخیی بووم،

بووبەمیوانی کۆڕی بەرسێبەری دارەبەنێ.

هەڵۆکەی خاڵخالآن وتی:

من لێرە ئارام ناگرم...

وەرن دوو (ڕومانە) م دەنێ.

ئەگەرئەمجارە خوایاربێ

بۆژوانی خۆشەویستانم...

دەڕۆمەوە لای (هەنارە)،

دەچمەوە پشتی ( چیمەنێ ).

★★★

کێلێ.. بەلووتکەی بەرزی(بڵفەت)و

بەمێژووی(فقێ ئەحمەد) سوێندت دەدەم

بەبیرت دێ..؟

ئەوسای دەستە کەی (کاك غەریب)٭

ئامادەبوون بپەڕنەوە لەگۆمی خوێن.

ئەوسای تەتەری پارتیزان

دزەی دەکرد بۆ(شارستێن)...

هەڵۆکەی خاڵخاڵان وتی:

ئەگەردوژمن گوڵزارەکان بسوتێنێ.

لەجێی هەربنەدارمێوێ،

مینێکمان بۆدابچێنێ.

من لێرە ئارام ناگرم...،

فێری ڕاوە کارمامزم..!!

دەڕۆمەوە بۆگەرمێنێ.

چەمی رەزان...!

بە(ئەشکەوت)و بنکەی (مامە) و

بەقەڵای (چوڵنگی) و بەرزی ،

بە تاڤگەی بەخوڕی (باڤڵ )،

بەشوێنەوارەکەی (زەرزی)...

سوێندت دەدەم..بەبیرت دێ؟

هەواڵ وتی:

بکوژانی (مامەریشە)و(حەمەغەفوور).

لەگەڵ سوپای ئەنفالچی دا..

بۆکێومالٚی کوردستانم،نزیك ودوور.

دەربەند دەربەند،ئاسۆ ئاسۆ.

دەگەڕێن بۆهەڵگرتنی شوێن پێی

(ئاوات)و(ئاکۆسوور).

★★★

خاڵخالآن !

ئەی پشت وپەنای لێقەوماوان،

بەمەزاری(ئۆمەرمەندان)

بەچاوگەی هەردووشیوەسوور

سوێندت دەدەم ،بەبیرت دێ..؟

ئەوسای شیعرێکی ئاوارەم

بووبووبەگری نەورۆزو...

بەولووتکانەوەدەسووتا.

ئەوسای(ئەحمەدبەگ)شەهیدبوو...

(عەلی صاڵح)دوا فیشەکی

لەتەوێڵی خۆی داکوتا.

(مەلائاراس)بەزیندوویی

راکشابوو لەتابووتا.

هەڵۆیەکی باڵ بەستراوت

هاواری کرد:بەشاهید بن .. !

بەردوداری ئەم هەرێمە،بەشاهیدبن.

لەکاتێکدا..

ئێمەهەموومان شەلاڵ بووین،

لەبەربارنی شەست تیرو

چەخماخەوگڕی نارنجۆك.

لەکاتێکدا تفەنگەکەم

برِبرِەی پشتی شکابوو..

هەڤاڵەکەم..سینگ وباڵێکی پێکرابوو،

هەڵی دەكێشان (فڕفڕۆك).

چاوم لێبوو تەپڵەڕەش و خۆفرۆشیك

گازیان دەكرد:

وەرنەوە خۆتان تەسلیم كەن،

ناتانكوژین..!

سوێند دەخۆین بەسەری سەرۆك..!!

★★★

دێدەوان..!

ئەی ئاسۆی رونی خۆرەتاوی(گردەڕەشە)

بەكۆتەڵی پیرەدارەكەی جارانت!

بەسالأنی ئازایەتی وبەرۆژانی تۆپبارانت.

بە(بێستانە)وبە(قەشقە)كەی شەهیدانت؛

سوندت دەدەم..

ئاگات لێ بوو؟

ئەوسای شیعرێكی ئاوارەم

لەگەڵ كاروانی شۆڕش دا

**بەسەرتەیمانی ئاگردا..پەڕینەوە،**

**چلۆن شکۆمەندی ( قەلاّ)....**

**لەتۆڕوداوی خیانەت،**

**لەتەپکەی پیلان دەربازبوو.**

**بەبیرت دی؟**

**ئەوشەوەی شەوی جوامێری و..**

**شەوی خۆکێشانەوەی شێرو**

**هاوڕێیانی(کاك ڕێباز)بوو.**

**ئەوشەوەی تاریکەشەوبوو**

**گاردی کۆماری دڕکەزی و**

**زنجیری تانگ بەردەباز بوو.**

**هەلّۆکەی خالّخالاّن وتی:**

**ئێمە (ئەنفال)نەی بەزاندین.**

**کارەساتەکەی( هەکاری )،**

**چەکی کوشندەی ( کیمیاوی )**

**نەی روخاندین.**

چۆن ئەمڕۆکە

دوای هەزاران شەڕەچەپۆك.

دوای خەزانی سنەوبەرەسەوزەکانی

بەردەم تەلاری (پەرلەمان)

بەپیلانی پووچ ونەزۆك.

جارێکی ترکۆڵ دەدەین و...

دێینەسەرچۆك..!!

★★★

باغچە..!

ئەی دەستەخوشکەکەی(سەفین)

بە(کەرکوك)وسەدان خۆزگە.

بەمەزارەروخاوەکەی (شەهیدفاقە)

بەشەهیدانی (چەمرگە)

بەنەبەزینی پێشمەرگە....

سوندت دەدەم

ئەوسای شیعرێکی بەرگری ناوسەنگەرم،

هاواری کرد:

من دوابزەی خۆراگری (مام عومەر)م.

من وورەی(ئومێدکەرکوکی)،

من (کاك هیوا ) ی تێکۆشەرم.

ئەوچرکەیەی رۆحیانەتی ( فاروق جەبار)

وەکوشەپۆل وبروسکە...

وەك گەردەلوول.

لەئاسمانی نەمری داتۆماری کرد

(پێنجی ئەیلوول).

تۆپێم بلّێ ! چاوت لێ بوو...؟

پارتیزانەکەی دوای (ئەنفال)،

هەلّۆخاکییەکەی (شێخ بزێنی)

بەرەوکام ئاسمان ...

کۆچی کرد..؟

١٩٩٦/١٠/١٥

## دووانه

لەشێنێ دا

لەپاینی (مامەندە)ی هەناسەسارد.

پۆلێ شەهید،

چەند ئەستێرەی داچۆڕاویان.

بەخاك سپارد.

لەشێنێ دا

لەپاڵ سایەی پیرە دارێ.

جووتێ ڕەش پۆشی دڵسوتاو

هەردوو ..لەپشتی مەزارێ.

بەدەم هەنسك و ژانەوە .

بەدەم قوڵپی گریانەوە.

دەیکەن بەشین وهاوارێ.

بۆنی خۆڵ وگڵکۆ دەکەن ،

هەردووکیان ..

بەڵێ،هەردووکیان بەجارێ:

(ئەمە ..گۆڕی شێری منە...)

لەوکاتەدا..

پیرە مێردێ دەست بەگۆچان.

بێئەوەی کەسیان بناسێ.

بەدیاریانەوە دەتاسێ.

ئەڵێ : ڕاستە..،بەڵێ ڕاستە...

لەبەر ڕێژنەی بارانی گڕ،

بەناچاری...

دووشەهید مان پێکەوە ناشت.

١٩٨٣ شێنێ

# چەك وتۆڵە

بۆ \ شەهید مەلائەکرەم سارتکی هاوڕێم

( هەورێ ) ووتی :

من شەهیدم باش دەناسی ،

وەکو لووتەم .

(قەندیل) ووتی :

لەمێژایە من چەپەری ئەم میللەتەم.

(دێدە وان )یش زریکاندی:

وەرن تەماشاکەن (قەشقە)م.

چۆن بۆتە تەم .

(زێ ی بچووك)یش شەپۆلی دا

ئەی نابینن...؟

چۆن خوێناوی بووە (شەرغە)م .

لەو کاتەدا ....

چەکی هاوڕێکەی نالاندی ،

بۆ سەندنەوەی (تۆڵە) ی (ئەکرەم)

## ژیلەمۆ

هەموو جارێ...

کە ئەستێرەیەکی سوور ،

بڵند بڵند ...

لەئاسمانی دڵسۆزییەوە

دادەکشێ، دێتەخوارێ .

هەموو جارێ ...

کەهەڵۆیەکی بەرزە فڕ

شەلاڵ لەنێو خوێنی سووردا

لە لووتکەوە بەرەو بنار ،

بەخوڕ وەك باران دا دەکا

لە بانیژگەی هەموو ماڵێ،

لەسێبەری گشت دەوارێ.

لەم کیشوەرەی دڵی مندا

له هه‌موو گه‌ڕه‌ك وشارێ.

له‌م ولاٚته یه‌خسیره‌دا ..

لافاوی تۆڵه هه‌ڵده‌ستێ،

رق ده‌بارێ...

★ ★ ★

بۆ جێت هێلاٚین...؟

بۆنێو خه‌رمانی داگیركه‌ر

تۆ پشكۆ بووی .

بۆڕاوی قه‌له ڕه‌شه‌كان،

هه‌ڵۆ تۆ بووی.

تۆ پێم ناڵێ ی چۆن ئا وا زوو

ده‌ستخه‌ڕۆ بووی .

نه‌ده‌بوو وا ..دوژمن باخۆش ،

ئێمه‌یش سڕكه‌ی ،

گیانه خۆتۆ ژیڵه‌مۆ بووی .

ئاخر كه‌ی تۆسه‌ره‌ڕۆ بووی...؟؟

★ ★ ★

بۆ جێت هێلاَین ؟

خۆتۆ بازووی توندوتۆڵی

ڕەنجدەران بووی .

خۆتۆ بزەی سەرە لێوی ،

منالاَن بووی .

خۆتۆ مۆتەکەی سەر دڵی

لەشکری داگیرکەران بووی .

تۆ کوڕی شاخ و سەنگەر بووی ،

کەی شایستەی فریودان و

نێچیری تۆڕی درۆ بووی .

★ ★ ★

بۆ جێت هێلاَین.. ؟

خۆتۆ  ئاوا ...

زۆرخەم ساردو زەبوون نەبووی .

خۆ تۆ  ماسی نابەڵە دی

دەریای عیشق وئەزموون نەبووی.

تۆبۆ (گەرمیان)..

وەك( بەمۆ ) بووی.

تۆ ڕێبوارێکی وێڵ نەبووی

تۆ پیاوێکی کەڵەك بازو..

بەفێل نەبووی .

تۆ پەروەردەی وڵاتی وەفا...

تۆ جوامێرو شارەزا بووی.

ئاخر خۆتۆ زۆر ئازا بووی.

دەپێم بڵێ چۆن وائاسان ،

کەوتیتەنێوتۆڕی پیلان،

مەگەرگیانە،تۆپەیامبەری ئاشتی و

گفتو گۆ بووی.؟؟

١٩٨٥ شێخ بزێنی

# داستانی ڕزگاری

<u>بۆ/ شەهیدی نەمرحەمەزیاد مەغریب (مەلائاراس )</u>

ڕێچکە بە ستن ...!

یەك یەك،دوو دوو .

ڕێگا ببڕن دەی کاکە زوو،

کەرت کەرت ،تیپ تیپ...

بەڕێ کەوتین.

لەسەد..ئاسۆگە سەرکەوتین .

لە( دابان)ەوە دەرکەوتین.

هەنگاو هەنگاوکەوتینە ڕێ.

بۆتۆماری داستانی نوێ.

تا مزگێنی بگەیەنین ،

بە گوێچکەی خەڵکی شارو دێ.

لەو کاروانی سەروەری یە...

کە خێڵمان چوو بەرەو کوێستان.

چاومان گێڕاهەتا  ژیلوان.

دیار نەبووی؟!!.

کەرێبواری،

دەهاتەسەرێ لەخوارێ.

رێمان دەگرت بۆ پرسیارێ....

وەلأمەکان ..

بەئاشکراو بەنهێنی

هەرئەوەبوون ،

کە تۆ کەنەفتی  برینی.

بروسکەی ئاسمان وزەوی بەرێ کران:

هاورێ ...لەخوارێ نەمێنی !.

لە شارباژێڕ  تا قەرەچوخ

لە شێروانە وە  تا کاروخ .

کات وشوێنی دیاری کراو چاوەرێ بوون.

شەوهات، رۆژهات . . .

تۆ نەهاتی ،

هەر خۆت مابووی لە (شێخ بزێنی).

★ ★ ★

مێژوو لەخاکی(بابان)دا

داستانی وای نەنووسیوە.

شاری هەڵمەت وقوربانی....

قەت ..نەبەردی وای نەدیووە.

هەر ئەوشەوە

لە(ئەزمەڕ)ەوە تا(گوڵێ)...،

بەردی ...داری .

بۆسەندنەوەی خوێنی شەهید..

لەگەڵ پێشمەرگە بەشدار بوون،

لەمەیدانی فیداکاری.

بەلاّم سەد داخ ومخابن...

کەلێنی ئێوە هەر دیار بوو،

لەنێو داستانی رزگاری.

ئای لەو شەوە ...

لەسەر(دووبرا).

لەو کەڵکەدا (مام برایم ) شەهیدکرا.

دەنگێ وتی:

چۆن چۆن ئاراس بەجێ ماوە.؟

بۆبەیانی ،

کاتێ تەتەرگەیشتەجێ

لەنامەیەك داهاتبوو:

لە( شەوگێڕ) ی شەهیداندا

لەپاڵ( هەمزە) و(مەلاجەوهەر)

دوا سەنگەرت بۆلێدراوە.

دەپێم بڵێ،

کەی ئێستاوەرزی کۆچت بوو،

بۆ..نامەی ماڵئاواییت نەنارد؟.

بۆ بێ پرس بەجێت هێشتین ؟؟

کێ شك دەبەم ،

خۆکەسیی کەم نایەتەیاد.

تۆ ڕۆیشتی ...

سەفەرت خێر

ئەی هاوڕێ ی لەدلأشیرین .

من دڵنیام ..

خۆ جاری تر ناتبینمەوە،

مەگەر لەخەودا بتبینم .

بەڵێن دەدەم ..لەپاش مەرگت ..
دۆستانت فەرامۆش نەکەم .
گڕی بڕوات خامۆش نەکەم .
لەجیاتی تۆ..
تێرچاودەبڕمە نێوچاوی،
(بنار)و کاکە (ئاراسن).
با هەژارانی گەلەکەم دەڵێم،
پۆستەری تۆ و مامەڕیشە....
بەبرژانگی چاوەکانما هەڵبواسن.
هەردوو دیوی مەدالیاکەم ،
دوو وێنەی ئێوەی لێ دەدەم ،
تا گەورەو بچووك ببینن،
دوو ( گیڤارا ) ی کورد بناسن .
ئەوا ئێستا لە پشتی (هەناران)ەوە.
لەداوێنی (قزلەر)ەوە
لەژێررەحمەتی کیمیاوی و
بەدیارغەمی یارانەوە .
روو دەکەمە زەحمەتکێشان...:

دەست لەنێو دەست ،

دەڕاپەڕن...!.

دوژمنانمان ..وڕن،کاسن.

ئەگەر ئێوە یەکگرتوو بن،

بۆدڕکی چاوی ناحەزان ...

هەمووتان (ریشە)و(ئاراس)

نیسانی١٩٨٧ هەناران

# دوو چەپکە شیعر

بۆ/ شـەهید (قـاسـم محمدکۆیی) هاوڕێم

لەو رۆژەوە ...فاشیستەکان ،

گوڵزارەکان ...دەسووتێنن .

خەڵکی ئەم وڵاتەی ئێمە ،

بۆ سەر گڵکۆی شەهیدەکان ،

شیعر دێنن .

( ١)

هەر دوێنێ بوو

سلێمانی گوتی :کۆیـە !.

لەپاڵ گڕی (باوەگوڕگوڕ)...

چەخماخەیەك بەدی دەکەین ،

ئەوە کوێ یە ؟؟.

کۆیە گوتی :

ئەوە گڕی (ئار پی جی )یە

ئەوە شالأۆی دەروونمە ،

بۆ شەهیدان کلْپە دەکات...

ئەی هەست ناکەن بەو بۆن سۆیە .

هەر ئەمرۆکە ...

زوو بەیـانی .

کۆیە ووتی : سلێمانی !!

دەزانـین تۆ خاوەنی( گردی سەیوان)ی .

لە سەیواندا،سە دان مەزار

ئارامگای قارەمانانە ،

ئێوە ...وەرن ...!

تەماشای (قازبەگیان) م کەن .

ئێوەش وەرن ..

سەردانی دێی (کاولان) م کەن.

هەر گوندێکی ئەم بنارە.

هەر گۆڕستانێك لەم شارە .

سەیوانێکە ...

(٢)

شەوێکی ڕەش وتاریك بوو.

(هەیبەت سوڵتان)

هەر لە(کەڵکی قەیوان)دەچوو،

توولەڕێ ی نێوان گوندوشاخ ،

وەك جارانی من و نەنکم ...

پێشمەرگەی دابوو بەشاندا

لەخوارەوە ،لەپێدەشت وبنارەوە .

بۆ بان دەچوو .

بەسەر کەوتین ،

بەبێڵ وپاچ ،بەسونگی ودەست .

چەند سەنگەری نوێمان هەڵبەست .

گوێمان هەڵخست ...گڤەگڤ بوو ،

بەچپە تێیان گەیاندین ،

لەشارەوە ...پۆل پۆل ئاگر ،

لەگەڵ هاڕەی رەشە با دێ.

تێ گەیشتین ...

هەر کەپکەشاخ ودەوەنە ..

بەلادا دێ.

سەنگەرەکان وەك پۆلاێ بوون

دوژمن لەئاستیان کلۆڵ بوو.

سەد مخابن ...!

هاوڕێ ی شەهید،

کەسەیری ئەملا وئەو لام کرد،

جێ ی سەنگەرە کەی تۆ چۆڵ بوو .

١٨ /١١/ ١٩٨٦ خەرابە

---

*شەهید قاسم محمد کۆیی لەساڵی١٩٥٩لە کۆیە دا چاوی بۆژیان هەڵهێنا بوو، لەساڵی١٩٨٠دا لە(پیرانەڕەش) برایەکی بەناوی (دڵشادمحمد) کۆپتەر شەهیدی دەکات.هاوڕێ قاسم ناهێڵێ چەکەکەی بکەوێتە زەوی، لە تیپی ٩٣ی کۆیە دەبێتە پێشمەرگە ی (ی.ن.ك) تالەشەوی ١٠ -١١ /١٠/١٩٨٦لەکەلی سێکانیانی کەرکوك شەهید دەبێت..

ئەم شیعرە لە ١٩٨٦/١١/٢٠ لەچلەی شەهیدی نەمر دا لە (کاولان ) خوێندرایەوە .

## پەیامی

# شیلانەوشەکرۆك

بۆ/ شەهید سید جوهر وهەڤاڵەکانی

لەم وەرزی گەلاْرێزانی هۆزانەدا ،

( سیروان ) ی شیعرێکم وتی:

لەبەهەشتەکەی(گۆران)دا،

لەشارەزوور .

لەو هەرێمەی....،

ڕۆحی هەزاران (عەزیز)*ی

تیاهەلْوەری،

بوون بەکۆی نوور .

چاوم لێ بوو ..باڵندەکان ،

لەسەر مەزاری چاکێکی شیرەمەڕی

پۆل پۆل کەپرۆکەیان دەکرد،

دەروێشەکانی خاك وخۆڵ ،

لەدیوانەکەی (ناڵی) دا

دەخوولانەوەوەك فڕفڕۆك.

عاشقانی ڕێبازەکەی کاکە(فازڵ)★★

بۆ گەرم کردنی کۆڕەکەی ،

وەك دڵسۆزانی( عاشورا )

سینەیان کردبوو بەدەف و...

تەپڵی سەریان گرمەی دەهات،

لەگەڵ چەپۆك.

لەم پایزی هەڵوەرین وخەزانەدا

(سەفین)ی شیعرێکم وتی:

لەو دەڤەرەی (شوانە)و(ئاکۆ)،

بوون بەدووئەستێرەی سوورو.

چوون بۆ ئاسۆ.

(کانەبی)و(ستار)و( مەهدی )یش

**بوون بەسێ موریدی ( صافی )**

**چاوم لێ بوو بەرێبازی رەنجدەراندا.**

**بەرەو (کاوانیان ) رۆیشتن،**

**بوون بەپۆلێ قارەمانی مێژووی(سۆران)**

**بوون بەپاڵەوانە ئازاکەی**

**نێو داستانەکەی (حەمەدۆك).**

★★★

**لەم وەرزی پەڵەی خوێنەدا**

**(هەورێ)ی هۆزانێکم وتی:**

**ئەگەر ئێستا ئێوەیش وەك من،**

**گوێتان لە زریکەی(خانزاد)و**

**لەنەواری ئەشکەوتەکەی(خرواتان)و**

**لەلاوکەکەی(کاوێس...)دەبوو**

**ئێوەیش وەك (بەنی هەریر)و،**

**وەك سێ دۆلآن...**

**نەفرەتتان لە خائین دەکرد،**

نوێژی رێزتان دادەبەستا....

بو (مەلانەجم) ی فەرماندەو

بۆ شێخە ردێن سوورەکەی ،

(شارباژێڕ)و (قەڵاچۆلان).

★★★

لەم وەرزی گەردەلوول وداستانەدا

لەم گەرمیانە وێرانەدا .

شیعرێکی (ئەنفال)م وتی:

ئەگەر ئێستا ئێوەیش وەك من

گوێتان لەناڵەی(چیمەن)و

چاوتان لەنسکی پیرێکی،

دێی ( لەك )دەبوو

جادەتان ووت:داستانی سەوز ..

کاڵایەو بەقەدباڵایە.

وا دایکێکی جگەر سووتاو ..

هاوار دەکات : تەماشا کەن!

بە(دەربەندیبازیان)ەوە.

بەسەر( شاخەسووران) ەوە.

بەسەربەردی (کەڵەکی باڵەیان)ەوە.

شاڵە سەوزەکەی یەکێتی ...

پشتێنەکەی (سەیدجەوهەر) م .

با دەی شەکێنێ ... ئالأیە .

لەم وەرزی کۆڵ نەدانەدا .

لەمەڵبەندەکەی(شیهاب)و(ئارام)ەو.

لە وڵاتی...

(سەدو هەشتاو دوو هەزار)

غەم و زامەوە.

منی دێوانە خەریکم،

حاڵی هوزانێ دەمگرێ،

بۆ (پێشمەرگەو)وبۆ (سەید...)و

بۆ (جوتیاروشێخ و مەلا)م

بۆ(سیامەند)و بۆ(باران)و....

بۆپۆلێ (بانی مارانی)و

بۆ(حەمە عەرەبی)★★★برام.

بو ئەو خوێنە خاوێنانەی،

لە سەنگەری بەرگری دا ،

تنۆك،تنۆك.

رژانە بن داری هیوای کوردایەتی و

بەرسێبەری سنەوبەرو..

داری شەکرۆك.

١٩٩٧/١١/٢٧

---

★سەید جەوهەرو عەزیزمامەلێسی و فازڵ شیرەمەڕی و

حمەعارەب و چەند هەڤاڵێکیان پێکەوە شەهید بوون.

# چاوەڕوانی

بۆ/شەهید (عبداللهأحمد خەرابەیی)

کەبەزیندوویی لەکۆپتەرفڕێدرایە خوارەوە..

کە لیوانی لێوەکانی

پڕاو پڕی خەندە دەبوو

بۆ پەنجەرەی دڵی هەمووئازیزانی

وەکو سروەی بەرەبەیان بوو.

چۆن دەرگای ماڵیان بۆ میوان ئاوالأبوو.

ئاواش دڵی،

گۆڤارێکی بەردیدی خۆشەویستان بوو.

فەرموو فەرمووی ،

وەك خۆی جوان بوو.

که دوو هەڵۆی چاوەکانی

بۆ ئاسۆی دووریان دەڕوانی.

دوندی ئاواتی ئاشتی بوو،

چونکە تەنیا لەوسایەوە،

دەگەیی بە کامەرانی.

لە مێژابوو..

لە گەڵ خۆشەویستەکەی دا ،

هیواو ئاواتی هەردووکیان ،

ئاوێزان بوو

ئای ناخۆشە چاوەڕوانی !

هەموو جارێ

کە مەلی خەیاڵی دەفڕی

ڕادەچەنی،

پێدەکەنی :

( ئۆخەی بۆ ڕۆژی خوازبێنی،

خۆزیا ... بۆ ئەوکاتە خۆشەی ،

له بەردەرگای ماڵەکەمان،

شایی وگۆڤەند وزەماوەند

بۆ گوند دەبێ بە مزگێنی )

کێ دەیزانی؟

ئەو سایەیەی کەهێلانەی نیازیان بوو

ناحەزان دێن،

دەیکەن بە سووتوی ئاگریان.

کەی ڕەوایە ؟

ئەو (نازدار)ەی

بە تان وپۆی بیری ووردی

سەدان تەونی دەهۆندەوە

پێکەنینیان کرد بە گریان.

★★★

شەو تەواوی ڕاکشابوو،

هێشتا بۆکازیوەی بەیان

زۆری مابوو،

هێرش، هێرش،

دەنگە دەنگ لەگوندپەیدا بوو

لە ماڵ دەرچوو ، بەپەلەپەل

لە گەڵ سەدان ئاوارەی تر،

پەراگەندەی کێوەکان بوو.

تاریك وڕوون،چاو لێك نانێ،

شانی دەنێ بە قەد شانی شاخێکەوە

بە نیازی حەسانەوە

کە ڕۆژ لە" سارا"وە هەڵدێ

پەنا دەبا بۆ ئەشکەوتێ

بە مەبەستی حەوانەوە.

هەر ئەودەمە،

لە هەرچوار لای سنوورەوە.

لە خۆرهەڵات وخۆر ئاوا و

لە باکوور وباشوورەوە.

لە نزیك و لە دوورەوە،

وەك سوپای تاتار ومەغۆل

بەر هەڵدابن لە هەردە وچۆڵ .

شەمشەمەکوێرەی( کۆپتەر) یان،

ڕەو ڕەو ، پۆل پۆل ،

دەبارێنن،سەگبەچەو زۆل

پاش نیوەڕۆ دەدۆزنەوە،

قارەمان وهیوا بە کۆڵ.

چوار کەناری تەیمان دەکەن

هێرش لە سەر هێرش دەبەن

تا ماسولکە و تا مەچەك و ..قامکەکانی.

توانای گرتنی گۆی مەمەی چەکیان دەبێ

لە تاو نرکەی تۆقیان دەچێ،

هەتا دوا بەردی کەلەك ژەن،

بۆ ئەو چەپەر وپەنابێ .

شاگردەکەی( مامەڕیشە)و

( نەعمانە گۆج) شێلو نابێ

کە مووشەکیش،

وەکو ئاواتی دێرینەی

دارو پەردوو بەسەریدا دەڕوخێنێ

ژار وبارووت بێنی دەگرن،

ئەشکیش چاوی دەنوقینێ

لە جیاتی باسکی بلوورین،

پۆستاڵ ڕەشێ،

زنجیری تێ دەئاڵێنێ

لە پێش ئەوەی تۆز ودوکەڵ بڕەونەوە..

چەند فڕفڕۆك !

بۆ ئاسمان بەرز دەبنەوە.

کاتێ  بە ئاگا دێتەوە.

کۆنە برینی دەکولێتەوە.

کە دوو گۆمی خوێن هەڵدێنێ

بە سەدان پێ...

زەوی لە نەوی دەبینێ

دەریای ڕقی شەپۆل دەدات :

( دەمبەن بۆ کوێ ؟

من نامەوێ لەوە زیاتر

لە( شارەکەی حاجی) دوور بم.

دوا کۆچی من لێرانەوە بخەنە ڕێ.)

دیارە بەوە..

نێو چاوانبان گرژ دەبی !

زیاتر نوقمی تاوان دەبن،

هەڵی دەگرن بە چوار دەستە،

بە زامی بێ تیمارەوە ،

لە گەڵ کۆمەڵێ جنێودا

بە زیندوویی فڕێ ی دەدەنە خوارەوە.

هاوار دەکات :

( ئاوا بە هەڵۆی مردن.

زۆر باشترە،

لە سەد ساڵی سەر شۆڕکردن.)

**لە پێش ئەوەی چنگ لەم**

**خاکەگیرکاتەوە،**

**بۆ دوا نیگا**

**تەماشایی کانی بەر مالآن دەکاتەوە.**

**مالئاوایی، لە گوندی ( خرابە) دەکاو**

**خوێنەکەی دەبێ بەپەینی نیشتمانی،**

**کۆتایی دێ چاوەڕوانی،**

**چەندین سالەی دەسگیرانی.**

**١٩٨٨ ئۆردوگای دێلزێ**

## هەتوانی باباگوڕگوڕ

کاتێ بینی ،چەقۆی زۆردار..

برینێکی کاریگەری

خستۆتە جەستەی شارەکەی .

کاتێ ئازار ناخی هەژان

زانی تیمار گرِی چەکە ،

تەنیا خەباتە چارەکەی .

رێگای سەختی تێکۆشان و

پارتیزانی بۆ هەڵبژارد

لەئەنجامدا هەر ئەورِێیە

گەیاندیە نێودڵی (شاخی) و

کوردستان و دڵی گەلە هەژارەکەی .

١٩٨٩

---

*شەهید هادی صالح سعید لە٢٢/٣/ ١٩٨٨

لەگوندی (شاناخسێ) بەچەکی (کیمیاوی) شەهید کرا .

## بانگەواز

دوێنێ..لەدوای رۆینەی ئاشتی

گوێم لەدایکی شەهیدێك بوو:

هۆهۆ رۆحیانەتی ریشە ...!

ئێستایش گەرمیان چاولەڕێتە.

لەگەڵ (سیروان)دا وەرەوە.

هۆ هۆ (هەڵمەت)ەکەی جاران

ئیستایش هەرئومێدمان پێتە.

ئەمجارەیش زیندووبەرەوە.

لەگەڵ هاورێ دێرینەکان..

دەروازەی شار بکەرەوە .

گەرجاری دی شۆڤینیەکان

دەرگاکەی (قەلا) یان ڕاتەکان..

بلێ :دیسان ڕاپەڕینە..!

هەلۆکان بابێنە خوارێ لەسەرەوە.

داگیرکەران بۆدەرەوە،بۆدەرەوە.

٢٠٠٨\٩\٦

## هێلانەی نوێ

ئەگەر تەوارێکی سوورخن.

شەلاڵ وەکوهەڵۆکانی

قووتەی(مامەندە)و(شیلانە).

ئەگەرشابازێکی شەرمن

دەلال وەکو(زەکیەئالکان)

ئازا وەکو (لەیلاقاسم)

چاپووك وەك (پەرژین)و(بەیان)..

وەك (زیلان)...

دەرچوو لەلانە.

هیچ دوورنییە ئێوارانێ.

نیوەشەوێ،بەربەیانێ.

لەهەڵمەتی دلێراندا.

لەبەرگری وتێکۆشاندا.

ئەستێرەی رۆحی داچۆڕێ،

ماڵئاوایی لەژیان بکا..و

بلێ:..ئێستا...ئیترکاتی دابڕانە.

ئیترکاتی کۆچی سوورو جێهێلانە.

من دڵنیام...

لەوساتەوە ئەوتەوارە،

لەبەهەشتی نەمراندا.

لەد یوانی شاعیراندا.

لەویژدانی هەڤالاّندا.

لەگشت لووتکە بەرزەکاندا.

لەباغچەی هونەرمەنداندا.

لەئاسمانی سەروەراندا....

شوێنێکی نوێ

بۆخۆی دەکا بەهێلانە.

١٩٩٧ سلێمانی

تۆ.....!

رووناکی شەوی تاریکی شارێك بووی،

شار زیندانەو ...

خەڵکەکیشی لەپەنجەرەی ئاواتەوە ،

چاویان بڕیوەتە ئاسۆ .

تۆ زاخاوی دەمی خەنجەری شیعرێ بووی،

شیعریش لەگەڵ بیرەوەری،...

لەنێو ژێرزەمینەکاندا ...

مۆرانەو کەڕوو لێیدابوون .

کە ئاگریش هێرشی سووتانی هێنا ،

لەگەڵ شاعیرە شەیداکە....

بۆئەودیوی سنوورەکان تەوەلابوون .

تۆ هاواری سەرمنارەی مزگەوتێك بووی،

ئێستا قورئان و ئاوایی خۆڵکەوین ،

هەتا مزگەوت نەڕوخابوو ،

شوانی بەرمەڕ لەلای ڕانی .

پیرەمێردی بەرهەیوانی .

بووبو بەوێردی سەر زاریان ..

بەسروود و بەگۆرانی :

ئەم ولأتە..

کانگای هەزاران بەرهەم و

سەدان دەسکەوت وداهاتە .

کەچی دانیشتووانی برسی،

نیشتمانیان .گۆڕەپانی،

تاقیکاری وکارەساتە.

چونکە خاوەن ماڵ میوانە و

دزو تالأنچی...لەجێگای

خاوەن ماڵ ودەسەلأتە .

* * *

تۆ مامۆستای وانەی گەل بووی.

رقی گەلیش(باوەگورِگورِ)

لەهەر کۆڕوکۆمەلێك دا

ئەگەر دەرفەتێك هەبووایە ،

تیغی وشەت دەچەقاندە

**بیلبیلەی چاوی ئەوانەی ...**

**بەنارەوا دەمان کوژن ،دەمان برن.**

**وەك چۆن( خاسە )لەپاولەپ دێ،**

**زیندانەکانی شارەکەم ،**

**لەرۆڵەی کورد پڕاو پڕن.**

**⋆ ⋆ ⋆**

**تۆ شێرێ بووی ،**

**ترس لەبەر تووڕەبوونت تۆقی دەچوو،**

**تۆ خۆت ئازابووی.. ناترسای .**

**کەوەك چرا ..هەڵ دەبووی و**

**وەك بیرە نەوت دادەگیرسای .**

**پە نجەی ڕاستیت دەکردبەچاوی درۆدا،**

**ئاخر بۆیە ..تۆمامۆستای .**

**دەی لەدنیای نەمری دا ...**

**وەك ئەستێرە بدرەوشێوە .**

**وەك گوڵەمێلاقەی(مەرزیخە)بگەشێوە**

**تۆ لە دنیاجۆگە نەبووی،**

**تۆ دەریابووی .**

تۆ ئۆقیانووسی ئارام بووی

بەدەمی چکۆڵەی ئەوان گلاّونابووی .

هەرتۆنەبووی،

پەچەی رەشت هەڵدەداوە؟؟:

کەی ڕەوایە جیّ ی سەپانی وکاکیّشانم .

شویّن بەکرەیی وجیّ خەرمانم ...

بارەگای جەردەو سیخوڕن.

کەی ڕەوایە لەکوچەو کۆلاّنی شاردا .

لەنیّو قەیسەری وبازاڕدا .

رەو ڕەو گورگەهار دەگەڕن.

هەموو دەلّیی سەگی دڕن.

بەلای هەرکیّ دا ڕابوورن ،

پیّی دەگەزن ، پیّی دەوەڕن

★ ★ ★

تۆ سەروەر بووی .

تۆ لەنیّو دلّی خەلّکی دا،بەختەوەربووی ...

تۆ نویّنەری( پیّغەمبەر )بووی.

وانەکانت فیّری کردین :

ژیان ..فێرگەیە .

زانست.. تفەنگ وسەنگەری پێشمەرگەیە.

خەبات...پێویستی سەرشانە .

مردن لەڕێی سەربەرزی دا،هەرژیانـە .

کەتۆ چوویت و نەهاتییەوە ،

لەوساکەوە ...

هەر زمانێك سنووری دەنگ ببەزێنێ.

هەر ڕەنجدەرێك.. چەوساوەیەك.. تێگەیێنێ.

هەر زارێك ناوی کورد...بێنێ.

داخی دەکەن ،خشت دەیبڕن .

★ ★ ★

تۆ پێشەوایەکی ژیر بووی .

کردەوەکانت گەنج ئاسا ،

هەر چەند پیر بووی .

کەفاشییەکان ترسیان لێ نیشت،

چرای ژینتیان کوژاندەوە .

ئەوگێلانە نەیانزانی ،

بەخوێنی تۆ ...

خەوی سەدان چەوساوەیان ڕەواندەوە.

لەوساکەوە ..کەتۆ چوویت ونەهاتییەوە،

لەگەڵ گشت تۆئاسایەکدا ڕەقن ،دژن .

لە(هیئەالخاصە)ی کەرکوك دا...

خوێن دەمژن.

رۆژ نییە تاوانێك نەکەن،

(لەتیف حامید)ێك جوانەمەرگ

(ئەنوەر زۆراب)ێك نەکوژن .

تۆ شەهید بووی ،

خوێنی سوورت کەڕژایەسەرخاکی کورد

زەوی وتی :پاش سەدان ساڵ

دەبێ مێژوو بیسەلمێنێ،

( لالۆ ) نەمردووە،ماوە .

لە (تۆبزاوا ) لەخوارووی شار

لەپایینی ئاگرەسوورە،

لەکوردستان دا نێژراوە .

١٩٨٨ شێخ بزێنی

## سابا تەکەی مام ئەحمەد

پێشکەشە بەشەهید (ئاکۆسوور ) خانەوادەکەی

لەبەرساباتی کەپرێکدا

دۆش داماووم ،

فەرهەنگێکم لەبەردەستە ،

یەکە یەکە وشەکانی

مێژووی شۆڕشی گەلانە.

لەبەرسێبەری هەوارێك

سام گرتوومی ،

کلاڵفەی ژان دەکەمەوە

هەرهەڵسانەوە و گلانە.

لەگوێی رووباری(شیوەسوور)

لەسەر رێبازی خۆم سوورم،

هەرچەند دەکەم قەڵەمەکەم

لە ئاست سەربەرزی(مام ئەحمەد)

کەڕولاڵە.

کەشکۆڵی وشەم بەتاڵە.

بەناچاری دەچمەوە هەواری خاڵی

برووسکەیەك بەرێ دەکەم :

(ئێرە..چەمی کاولەسوارە)

لەشوێنێکدا کرنۆش دەبەم

بەرلەئەنفال ئاوەدان بوو.

بەرلەکۆچی زۆرەملێ...

شوێن ماڵەکەی

مام ئەحمەدی قارەمان بوو.

هەرلەوێوە دێم داستانێك دەگێڕمەوە.

برینی خۆم دەکولێنمەوە.

ئێرە.. مەکۆی پارتیزانی و

ئێرە تەکیەو دیوەخان بوو.

هەرلێرەبوو(مام برایم)و(ئاکۆسوور)...

بەگڕ ئاگرداچوونەوە ...

(مەلائاراس)و(کاك عەلی)...

بەدەیان جارکۆبوونەوە.

چی بنووسم؟؟

چیتر تیری بیرکردنەوەم

وەکوجارانی بڕناکا .

دەستم لەحەیفا سڕبووە ،

ئاخرئەنگوستم گۆناکا.

تەماشاکەن !

ئەم دیمەنەم لەپێش چاوە:

پیرەمێردێك ..

گشت کوڕەکانی پێشمەرگەن،

لێقەوماوە،

جوتیاریکی زۆرهەژارومیواندارە

چەند بلێی هێندە ماندووە.

ژێرهەردووپێی پۆقژەیە،

هەردەپەنجەو هەردوولەپی قلیشاوە.

پیرەژنێك..

هاوڕێی هەموو تەمەنییەتی

لەتەنیشتی دۆش داماوە.

پێی لەسەر ملی بێلێکەو

وەکوپەیکەر ..راوەستاوە.

بەرلەچەندساڵ

ئێرە ..ماڵی مام ئەحمەدبوو.

ئەو دیمەنەی نیشانم دان

ئەوەحاڵی مام ئەحمەد بوو.

ئیتر دواترئەنفال هات..

لەزێدی خۆی تەولابوو.

ئاوارەی ئەودیو سێبەری

منارەی چۆلی و قەلآبوو.

دەسبەسەری(کەورگۆسك)و

تووشی سەد دەرد و بەلآبوو.

★★★

لەدوای لەت بوونی ...جگەری

هەناوی پڕبوو لەژان و

هەناسەی تەژی لەبۆن سۆ.

ئیتر زیکری پاش نوێژانی

هەرپاڕانەوەی تەمەن بوو

بۆ کاکە(یونس)و(ئاکۆ).

لەگەڵ چەخماخەی(بروسك)وراپەڕیندا.

لەگەڵ یەکەم بوومەلەرزەو ڕاچەنیندا.

تارماییەك دەرگای ماڵی تاریك کردن.

بووبەچرای ئەوشەوەیان بەرلەمردن .

ئەوە یونس بوو هاتەوە

گەردنی خۆی پێ ئازا کردن.

ڕێبوارێکی بەپەلە بوو

پێڵاوەکانی دانەکەند دوای هیلاکی.

یەك سەر چووبۆ(گردەڕەشە)

بۆسەرگڵکۆی هەردووکاکی.

ئیتر چیتر نەهاتەوە ،

لەگەڵ نەورۆز هەنگاوەی نا،بەبێ باکی.

بووبەفیدای کوردستان و

بەجێی هێشتین بەغەمناکی .

★★★

هۆخەڵکینە تەماشاکەن!

ئەوجێگایە ئێستاخانەقای ویژدانە.

سەربوردەی ژیانی مام ئەحمەد

لەدەفتەری سەروەریدا

لەنێو پەڕەی دڵی من و..

وا لەدەزگای شەهیدانە.

وەرن باهەموو پێکەوە

بچینە زیارەتی مام ئەحمەد

گوێ رادێرین بۆ لاوك سروودەكان

هەموو داستان و سەروەرین.

با تەماشای دڵی دایە(مریەم)بکەین

ئەلبومێکی پڕلە خاچە

جا دەزانین پێنج ئەستێرە

لەئاسمانی بەخشندەیی چۆن

ه ە ڵ و ە ر ی ن .

كەركوك ١٩٩٩

## چیا ★

**بۆ/هاورێی شەهیدم چیابیبانی**

**ئەستێرەکەی بەیانیم دی**

**هەر بەئاستەم نووزە ی تیابوو.**

**شیعرم ووتی:**

**لۆمەی مەکەن،**

**ئەوە بۆیە کز ..دامابوو**

**تەنیا لەبەر کۆچی پەلەی**

**ئەستێرەی سوور،**

**لەبەر دوورکەوتنەوەی( چیا )بوو.**

**شێخ بزینی١٩٨٧**

---

★شەهید چیابیبانی پێشمەرگەیەکی قارەمانی کوردستان بوو بەهۆی رۆکێت بارنکردنی گوندی (عەمدۆن )ەوە لەلایەن دووفرۆکەی رژێمەوە شەهیدبوو .

## شیعر..گوڵه

بۆ/ شەهیدسالارعبدالكریم كۆیی ناسراوبە( سالارە سوور )★

هاتووم..شیعربكەم بەچەپكەنێرگزێ..،

بۆیادگاری.

وشه وشه لەسەرئەم ئارامگایەدا

بیكەم بەجوانترین دیاری.

هاتووم..ئەگەر رێگابدەن..

داوا دەكەم لێم ببووری.

كەتۆم زۆرباش نەناسی بوو

بەڵام دوێنی خۆرلەزەردە،

كەهەتاوم لەكەل بینی

ئەوجا زانیم رەنگی وەكورەنگی تۆیە.

خۆتۆ سروودت نه دەخوێند..

بەڵام ئێستاهاورێكانت

(ئەی شەهیدان...)پێشكەش دەكەن

هەموو دەنگیان ..دەنگی تۆیە.

هۆ هۆ هاوڕێ سالارەکەم !

ئێستاچوومەنێودڵی پێشمەرگەیەك

بەدیارمەزارەکەی تۆوە دۆش دامابوو.

کەلێم پرسی...

بەقورگی پڕگریانەوە جوابی داوە:

بەوشەوە ڕەش وتاریکە

لەوڕچەپێچەوباریکە،پەلەی چی بوو.؟؟

★★★

ئەی هاوڕێ گیان !

هەرئەوشەوە خوێنی سوورت بووبەداستان

لەگەڵ سروودی(ئەی ڕەقیب)،

لەگەڵ نرکەی(ئەی شەهیدان)

گەڕاینەوە بەرەو(کاولان)★

ئای لەوشەوە .. لەوێ نەبووم

تێرتێرتەماشای بالآتکەم

بەلاّم ئێستا

کەچاو دەبڕمەنێوچاوی هاوڕێکانت،

دەزانم ماندوون بێ پشوون.

گەر جارێ تر لە(باوەجی)بەسەرکەوم،

لەبناری(ئاوەگرد)دا

گوێ لەدەنگدانەوەی ئەشکەوت و

هاژەی چەم ورووباربگرم.

باش دەتناسم..وەکو(هاموون)

★★★

ئەی هەڤاڵە سالارەکەم !

بریا هەموو دایکانی نشتیمان

وەکوئەودایکەی تۆدەبوون.

بریاهەمووباوکانی پێشمەرگەی گەلم

وەکوئەوباوکەی تۆدەبوون..

ئەوسا منیش دڵنیابووم

گشت لاوانی ولأتەکەم

وەك سالارەکەی کۆ دەبوون.

★★★

**هاوڕێ سووره ..!**

**ئەگەر ئێستا دایەی جەرگ ودڵ بریندار.**

**پرسیاربکا :- کوانێ سالار ...؟؟**

**هەموو دەبین بەکوڕی ئەو.**

**چەکەکەت نا خەینەزەوی**

**دەڵێین دایەئێمە ..ئەوین.**

**گەربپرسێ وەسیەتی چی بوو ؟؟**

**هەموو دەڵێین :تاسەرنەکەوین ناسرەوین.**

**چونکە ئێمەیش هەرپێشمەرگەی**

**کوردایەتی،**

**تێکۆشەری رێبازی پارتی پێشڕەوین. ★**

---

★شەهید لەساڵی ١٩٦١ لەبنەماڵەیەکی هەژاری شاری کۆیەچاوی هەڵهێنابوو، پێشمەرگەیەکی قارەمانی(ی.ن.ك )بوو،خۆشەویستی جەماوەربوو،لەشەوی٢٢-٢٣/٥/ ١٩٨٦لەچالاکییەکدا لەنێوان(کۆیە-تەقتەق)شەهیدبوو.رۆژی١٩٨٦/٧/٣ لەسەرگلکۆکەی لەگوندی(کاولان)ی دەشتی کۆیە کۆڕێك بۆرێزنان لەشەهید سازکرا،ئەم شیعرەم لەوێ پێشکەش کرد.

# زەنگوڵ

بۆ/شەهید فەرەیدوون بیرەسپان

تاریك ورِونی بەیانیٚ ..گورگە هاریٚ .

بۆ ملێ ومۆ،دەچیٚتە کۆنە هەواریٚ.

چاوی بەزەنگیٚلك دەکەویٚ،

لە سیٚبەری پیرە داریٚ.

رِقی رِەشی بە کاردیٚنیٚ

بە قورِدا بیباتە خواریٚ .

بەلاٚم دژی ئارەزوی ئەو

دەنگی زەنگوڵ درِدەدابەتاریکەشەو:

زەنگم، زەنگم،

ئەی گورگی هارچەندم لیٚدەی،

زیانی خۆتە دەرِوا دەنگم.

بۆ کویٚم دەبەی، من وون نابم ،

لە ناو ناچم !

ئەگەر  وورد وخاشیشم کەی

هێشتا لە گەڵتا دەجەنگم .

ها ها دەگەن بە هاناما

هاوڕێ ی قەڵەم وتفەنگم.

ئەو دەمەش من بافش نابم.

تۆ هەر گورگی و من هەرزەنگم .

تۆ هەر لورەلور دەزانی ..

منیش  دەبی بە ئاوازی کامەرانی .

زڕەی دەنگم  ★

کەرکوك ١٩٧٦

---

★شەهیدجوادشفیق نەجم بیرەسپانی ( فەرەیدوون ) لەدایك بووی ساڵی١٩٥٧بوو، ساڵی١٩٨٢زانکۆی تەواوکردو بوو بە( پ.م )

لە رۆژی ٦/١/ ١٩٨٣شەهیدبوو.

چەندین کورتەچیرۆکی لەگۆڤاری (رۆژی کردستان) لە(گزنگ) بلاۆکردۆتەوە .لە دوای هەواڵی شەهیدبوونی ئەم چوارینەیەم پێشکەشکرد:

خوێنی فەریدوون لە(ئاومالّ)چۆڕا.

بەلاّم  ئەوخوێنە، نەچوو لە خۆڕا.

نمامی سەوزی ئەم خاکەی ئاو دا

دوای شەهیدبوونی کوردستان گۆڕا.

١٩٨٣

ئەگەرجاران..

لەحوجرەکەی (سێگردکان) دا.

بۆ چنینەوەی زانیاری کێ بەرکێ بوو.

گەر مزگەوتەکەی (مەلای رەش )

پڕفەقێ بوو.

ئەگەر جاران (ئۆمرگومەت)

خوێندنگای (ئەحمەدی کوڕ) و..

دەیان زانای تری لێ بوو.

ئەگەرجاران (حاجی قادر(

موژدەی شیعری بەرەنگاری

کوردیی پیَ بوو.

لەدوای ئەوان ..

لەم هەریّمە بریندارە .

لەم دەڤەرە پڕئازارە .

(مەلاعبداللآی جوتیار) هات بووبەهەتاو.

(عبدالرزاق)بووبەئەستیّرەی سوورو

بووبەلوتکەی کوڕەکاژاو.

(ئاکۆ)بووبەقارەمانی

دوای(ئەنفال)و..(پارتیزانی)

(علی صالح) بانگی (ئەحمەدقەمبەری

)کرد..

بوون بەدووبازی کویّستانی.

ئەم دەڤەرە قەت چۆل وبیابان نابیَ

ئەم هەریّمە خۆی هەریّمی جوامیّرانە

قەت بیَ مەلا و میرزا نابیَ .

ئاوی شیرناوی (رەزحەلە)

(مەلائارس) ی پیّگەیاند.

ئەویش بووبەماموّستای وانە ..

( مام برایم )و (خاڵەبەخە)ی

بانگەوازکرد

ئەم ڕێبازەی تێیان گەیاند.

★★★

ئەم هەرێمە هەرێمی تێکۆشەرانە.

بەبیرتان دێ ؟

لە(گۆڕقەرەج)ی وێرانە .

بروسکەیەك هات بەپەلە.

گەیشتە دەستی ڕێبوارێك

لەسەرشاخی (کانی لەلە ) :

ئەگەر دەڵێن (عبدالقادر )

لە خانەقاکەی (کەرکوك )دا شارەزابوو.

نموونەی پیاوی بە ئەزموون زۆرئازابوو.

لەدوای ئەو ڕووناکایی یە .

لەجێی ئەو تروسکایی یە .

چراکەی (مەلا محی الدین )

مۆمەکەی (کۆمیتەی ئاگر)

لەسەر دەست (مەلا میرزا)بوو.

★★★

بەداخەوە ئەم پیاوە مەزنەرۆیی..

بەرگەی خەمی کوردی نەگرت ،

بەجێی هیشتین بە کەساسی.

تاکۆچی یەکجاری نەکرد ،

نەمان ناسی !

★★★

ئیستایش لێرە ،

لەم بڵندگۆو مینبەرەوە.

لەبیرەوەری چلەی

ئەم (مەلا) تێکۆشەرەوە.

لەکۆڕی پڕشکۆمەندیی

ئەم مامۆستا سەروەرەوە.

من دڵنیام ئەم کوانووەناکوژێتەوە،

ئەم کاروانی سەروەری یە

وا زووبەزوو نابڕێتەوە.

ئەم ئاگردانە رووناکە

بەفووی دوژمن

هەرگیز دانامرکێتەوە (٭)
من دڵنیام ئەم ئاگردانەی گۆڕقەرەج
(حاجی قادر) پێی کردووە
تائەبەد ناکوژێتەوە.
دڵنیا بن !
ئەگەر تێکۆشەرێکمان بڕوا
ئەگەر سەروەرێکمان بڕوا
بە سەدان ..جێ دەگرێتەوە .
٭٭٭
ئەم دەڤەرە بێ مامۆستا و
میرزا نابێ
میرزا ..ئێستایش
لەنێودڵی هەڤا ڵانی هەر میرزایە.
میرزا ..ئیستایش
لەبەرچاوی خوێندکارانی مامۆستایە.
میرزا ..ئێستایش
لەمزگەوتەکەی گۆڕقەرەج
وتار خوێن و پێشەوایە.

من دلّنیام ..ئەم جوتیارە

لەخاکی کوردایەتی وخواناسی دا ..

تۆوێکی وای وەشاندووە.

من دلّنیام ئەم باخەوانە هەژارە

لەباغچەی (علم)و(هۆشیاری )...

سەدان نمامی چاندووە.

بۆیە ئیستا ئێوەیش هەموو دلّنیابن !

چوونکە خەڵکی لێی رەزایە.

ئیستا (میرزا) لەبەهەشتی نەمری دا

لەنێوکۆشکێکی ..بەرزایە.

★★★

---

★شاعیر بۆبەلگە شیعیکی بلاّونەکراوەی (مەلا محمدنوری )
کوری مامۆستا (مەلائەحمەدی کۆری ئۆمەرگومەتی )خویندەوە.

**لەو رۆژەوە ...فاشیستەکان ،**

**گوڵزارەکان ...دەسووتێنن .**

**خەڵکی ئەم وڵاتەی ئێمە ،**

**بۆسەرگڵکۆی شەهیدەکان ،**

**شیعر دێنن .**

**هەر دوێنێ بوو سلێمانی گوتی :کۆیـە !.**

**لەپاڵ گڕی(باوەگوڕگوڕ)...**

**چەخماخەیەك بەدی دەکەین ،**

**ئەوە کوێ یە ؟؟.**

**کۆیە گوتی :ئەوە گڕی(ئارِ پی جی )یە،**

**ئەوە شالاوی دەرووننمە،بۆشەهیدان کلْپەدەکات...**

**ئەی هەست ناکەن بەو بۆن سۆیە .**

**هەرئەمرۆکە..زوو بەیـــانی .**

**کۆیە ووتی : سلێمانی !!**

**دەزانین تۆ خاوەنی(گردی سەیوان)ی .**

**ئەگەر سەیوان، ئارامگای قارەمانانە**

ئێوه ...وەرن !

تەماشای(قازبەگیان)م کەن .

ئێوەش وەرن ...

سەردانی دێی(کاولان)م کەن.

هەر گوندێکی ئەم بناره.

هەر گۆڕستانێك لەم شاره،سەیوانێکه.

شەوێکی ڕەش وتاریك بوو.

(هەیبەت سوڵتان)

هەر له(کەڵکی قەیوان)دەچوو،

تووله‌ڕێ ی نێوان گوندوشاخ ،

وەك جارانی من و نەنکم ...

پێشمەرگەی دابوو بەشاندا

لەپێدەشت وبنارەوه .

بۆ بان دەچوو .

بەسەر کەوتین ...

بەبێڵ وپاچ ،بەسونگی ودەست .

چەند سەنگەری نوێمان هەڵبەست .

گوێمان هەڵخست ...گڤه گڤ بوو ،

بەچپە تێیان گەیاندین ،

لەشارەوە ...پۆل پۆل ئاگر ،

لەگەڵ هاڕەی رەشەبا دێ.

هەر کەپکەشاخ ودەوەنە ..بەلادا دێ.

سەنگەرەکان وەك پۆلاً بوون

دوژمن لەئاستیان کلۆڵ بوو.

سەد مخابن ..هاوڕێ ی شەهید،

کەسەیری ئەملا وئەو لام کرد،

جێ ی سەنگەرە کەی تۆ چۆڵ بوو .

١٨ /١١/ ١٩٨٦ خەرابە

---

*ئەم شیعرەم لە ٢٠ /١١/ ١٩٨٦دا

لەچلەی شەهیددا لەگوندی (کاولان) خوێندەوە

## بەرخۆدان ⋆

ئەی هەڤاڵەخۆڕاگرەکەی

ڕێی خەبات وتێکۆشانم.

ئەی شێرەکەی،

نەبەردەکەی(حاجیتان)م.

ئەی هەڵۆبەرزەفڕەکەی

لووتکەی(هەلاج)و(دابان)م.

ئەی پارتیزانەئازاکەی

کوڕی هەڵمەت و داستانم.

ئەی شابازەکەی(ناوشوان)م.

دەبا ئەمڕۆ..

لەساڵیادی شەهیدبوونتا

پێشکەشت بێ،

چەپکێ گوڵی شیعرەکانم.

⋆⋆⋆

لەمێژایە...

لەنشتیمانی خۆماندا،

دێن وشەڕمان پێ دەفرۆشن.

لەمێژایە...

ئێمەتێنووی ئازادین و

ناحەزانیش وەکووزەروو

ئارەقی رەنجمان دەنۆشن.

هەتائێستایش..

ئەم ولأتە تالأن دەکەن.

گوندوشارمان وێران دەکەن.

دەشت ودەرو خەلەوخەرمان

هەمووی ئاگرباران دەکەن.

هەتائێستایش ..بۆیان بلوێ

خوینی پاکمان حلال دەکەن..

کۆرپەی ساواو پیروجوانمان،

ئەنفال دەکەن.

تاوان لەدوای تاوان دەکەن.

بۆیە..ئێمەیش

لەسەنگەری بەرەنگاری وتێکۆشاندا.

لەنێوکڵپەی شۆڕشگێڕی وبەرخۆداندا.

لەمەتەرێزی ئازایی وکۆڵنەداندا.

تەنیاوتەنیا خوێنی سووری شەهیدانە.

هەرکوردستان یانەمان و

نەسرەوتن تاسەرکەوتن ڕێبازمانە.

ئەم دەڤەرە سەنگەری سەروەریەکانە.

ئەم هەرێمە تابەردیشی قارەمانە.

ئەوە(دەربەند)خۆی شاهیدە،

لەگەڵ یەکەم بانگەوازی(شێخی نەمر)

جوامێرەکانی گەرمیان بوون..

گوتیان : بەڵێ ئێوە لەدەروازەی دەربەند،

لەپاڵ(بەردەقارەمان)دا

دڵتان لای مسکی خەنجەرو

پەنجە لەسەر پەلەپیتکە،

چاوتان دانێن لەسەرسێرە.

لە وێوە هەتا (بان مەقان)

لە(کەرکوك)ەوە تا(حەمرین)

کام سەنگەر قوربانی دەوێ

بەڕۆڵەی (شوان) و(شێخ بزێنی)،

بە(قەلاّسێوکە)و(جەباری).،

بەهێزی ئێمە بسپێرە.

★★★

ئەوەمێژوو..خۆی شاهیدە

لەگەڵ یەکەم بانگەوازدا

لە نۆ هەتا یازدەی ئەیلول.

یەکەم دەسڕێژ لەداگیرکەر

دلێرەکانی ئێمەبوون،

لەبەرایی کاروانەوە.

بەبەرچاوی سۆران وبادینانەوە.

بە (ماوزەڕ)وبە(بڕنەو)و بەسەنگەوە.

بەخەنجەرو بەچەند کۆنە تفەنگەوە.

بەوکەم ئەزموونی جەنگەوە.

دەچوون بەپیری مەرگەوە.

★★★

دەبا مێژوو بەشاهیدبێ،لەدوای(نسکۆ)

دوای تیژبوونی زوڵمی چەقۆ.

لە(چەم ڕێزان)ەوە بۆ( قەندیل )

تەتەر کەوتبووە هاتووچۆ.

(کاکەعەلی)و(مامبێستوون)..

لەدێی(عەسکەر).

(حەمەغەفوور) لە (ئاغجەلەر).

(سیروان...)و(خالید گەرمیانی)...

نەفرەتیان کردلەبەزین و لەڕاگوێزان.

دروودیان نارد بۆ (شۆڕشی نوێ)

بەخۆشیان بوون بەپارتیزان.

★★★

بۆیە لەدوای بەرخۆدان وهەڵسانەوە.

دوای چالاکی و بووژانەوە.

سلێمانی..لەبەردەرگای دادگای ویژدان.

سێ جارسوێندی خواردبە(سەیوان):

خۆم گوێم لێبوو(پیرەمەگرون)

بەگوێی(گۆیژە)دا دەیچرپان..

تۆ داستانی دوازدە سوارەی مەریوانت

گوێ لێ بووە،

منیش یازدەسوارەی قازان.

ئەم داستانە ،لەم گەرمیانە.

بۆتەوێردی گەورەوبچووك.

(كاك ئەنوەر)و دە ئەستێرە

بوون بەیازدە چەپكەنێرگز..

بۆبەرۆكی شاری(كەركووك).

★★★

دەبا مێژوو خۆی شاهید بێ،

هەرخۆی ببێت بە( پشتیوان )

یەکەم شەڕی نێوگوندەکان ،

لە(مام ڕەش)ی ئێمە قەوما،

بەیانی بوو..

لەگەڵ جریوەی خاوەرۆ لە(ماسقەلان) .

(شوان)یان لەشیرین خەوهەڵسان

پێنج شابازی ئازاو دلێر

پێنج شاگردی(نازمی حەمەی سلێمان).

بوون بەچراو بە(مەشخەڵان).

★★★

(شەوبۆ)ئەی خوشکە شۆخەکەم !

ئەوەمنم ..گوێت لەدەنگمە؟

(ئازادهەورامی) براتم.

ئەوە منم ..ڕێبواری هات ونەهاتم.

ئەمە ڕێبازی(ئارام)و(هەڵۆی سوور)ە.

ئەم کاروانە .. هەردەبێ بگا بەمەنزڵ

هەرچەند ڕێگا سەخت ودوورە.

★★★

هۆشارەکەی(ئەحمەدبچکۆل)!

شاری قەلأی(سپی حەسار)،

ئەی(شۆڕش)ی دڵ هەڵقرچاو.

لانکەی(سۆران)و(گۆران)م

بێشکەی(پورەگوڵە)ی داماو.

لەدوای سروودی ڕاپەڕین

ئەوە رۆحیانەتی( ڕیشە )

هاواردەکات:

چقڵی چاوی ناحەزانی.

دوژمنی(ئەنفالچی)یەکانی.

نەیاری گەوج ونەزانی.

بۆئێمەیش هەرسۆمای چاوی.

★★★

خۆشەویستان.دڵ لەمستان

ئەوەی ئێوە لەمن بیستتان.

لەگوڵزاری شەهیدانی

ئەم سنووورە زامدارەدا.

لەئینجانەی پڕلەگوڵی ئەم شارەدا.

چەندچەپکێکی سەرەڕێ بوو.

ئیتر ..فەرموون ئێوەو ویژدان.

جێ ی خۆیەتی رێبازی شەهید ون نەکەن ،

پیرۆزە ڕێگای شەهیدان.

دەتۆیش لەنێو گڵكۆكەتدا بحەسێوە!

کاروانەکەت بەڕێوەیە،بێ ڕاوەستان.

رۆژێك دادێ ئەم گەلە دەگابە ئامانج،

دەگەینە (قودسی کوردستان).

---

ئەم شیعرە لەساڵیادی شەهیدکریم حاجی نۆکەڵە( کریمەریشە)دالەشاری چەمچەمال لەکۆڕێکی گەورەدا لەلایەن شاعیرەوە پێشکەشکرا.

# حەیف..

پێشکەشە بە:سەرۆك مام جەلال

حەیفە..!پایتەختی شارەزوور،
لەدەستمان بڕوا بەفیڕۆ.
گەڕەلاوژێیە لەم شارە،
وابڕوا...دەبین دەست خەڕۆ .
یەك دەیدزێ،یەك دەیگۆڕێ..
راستییەکان ون دەکەن لەتۆ
منیش وا لە داخان دەمرم ..
چاك نابێ بەپینەو پەڕۆ.
هەرچی جڕو جانەوەرە ...
هەمووسەریان تێ ژەنیوە
تکایە تا چاکی نەکەی ..
ئەمجارە لەم شارە مەڕۆ.

٢٠٠٩ \٩\٩

کەرکوك

شارێك هەیە..

مێژوو..شایەتی بۆدەدا

هەتادۆێنیٚ،

خۆی پایتەختی شارەزووربوو.

شارێك هەیە..

لەکۆن کۆنەوە تائێستا،

ئاگردانی( باباگوڕگوڕ)

کوانووی ئاگرێکی سووربوو .

شارێك هەیە..

لەبەردەمی لەشکرکێشی دوژمناندا،

(قەلاٚ)ی خۆڕاگری و مەردی..

سەنگەری کوردی جەسوورە.

لە(داکوکا)و(ئەربائیلۆ)پرسیاربکەن،

ئەوشارە شاری( ئەربخا )

پەرستگای خواوەندی نوورە.

بەبیرم دێ پیرەمێدێك

باسی ئەوشارەی بۆ دەكردم :

لەم لاوە(قەندیل) كەوشەن و

لەولاوە(حەمرین) سنوورە.

كاتێ كەچاوم هەڵهێنا

نێچیری بەرگورگەهار و،

لە داوێنی لوورە لوورە.

شارێك هەیە..

شاگردەكەی(حوزنی..)ووتی:

ئەم شارە سەردەمێ (نووزی)و...

سەردەمێ ناوی (گاسوور)بوو.

(رۆژبەیانی)یش،هاواری كرد:

بەر لەچەخماخەی شمشێرو..

رفاندنی كەنیزەی كورد

ئێره لەچاوی(جەهالەت)،

لەتالأن و ئەنفال دووربوو.

ئێستایش وەرن باپێکەوە،

سەریك بدەین لە(خانەقا )

بگەڕێینەوە بەرتەکیە،

من(کرێکار)ێك دەناسم!!

لە لەخلۆەتگەی تەریقەتی(یەکێتی)دا

هەمیشە هاودەمی زیکری

(کاکە..سوور)بوو.

بابزانین ، ئەوان چی دەگێڕنەوە،

چۆن لە(کۆمیتەی ئاگر)دا.

نێوگەمارۆی ڕق وگڕدا .

ئەم میللەتە داستانی نوێی تۆماردەکرد،

پێشمەرگەی ئەم سەرووەریانەیش،

کاکە(مەلامحی الدین)و...

دەیان( قارەمان )و(شاهۆ)و

دەیان(دڵسۆز)و(...قەمبوور)بوو.

شارێك هەیە..

ئێستایش بڕوانی ئەوشارە،

شوێنەواری(تەعریب)دیارە.

هێشتا هەروێرانەخاکە،هەرخاپوورە.

هەمووڕۆژێك دژمنانی بەقینەوە،

بۆی دەنێرن ..تەقینەوە.

بەلاّم بەلاّم ..من دڵنیام

بائەوانیش دڵنیابن،

کورد خۆی ئاشنای بەرئاگرە

هەروەك پۆلاْ قالْ دەبێتەوە لەکوورە.

شارێك هەیە ..

ئێستایش ئەوشارە وەك(قەلاّ)خۆڕاگرە.

رۆحمان بۆکردوەبەشوورە.

ئێستایش سەدان(حاجی)و(ڕیشە)

لەبەر رووناکی ئەوگڕە.

لەدەوری باڵای دەگەڕێن

دەکەن کلیلەو تەندوورە.

هۆشارەکەم !

بەبیرت دێ کەدەمان گووت:

دیکتاتۆرشێرەبە فرینەو مقەبایە،

تەبەدوورە.

بەبیرت دێ کەدەمانگووت:

دڵگیرمەبە ،رۆژێ دادێ

هەر رۆڵەیەکت ڕاپەڕێ

هەرکۆمیتەکەی ئاگرو

(هەڵۆی سوور)ە.

بەبیرت دێ کەدەمانگووت:

سەنگەری خەبات چۆل نابێت،

هەر چەوساوەیەك بدوێنی

(ئازادهەورامی)و(حەمەرەڕش)،

( ئاراس )و( برایمەسوور)ە.

هەرپێشمەرگەیەك تورەبێت

رۆحی كاك(عەلی عەسكەری)

وكاك(ئەنوەر)و( نازم)و(حەمەغەفوور) ە.

هۆشارەكەم!

نازانم لەئاست بەرزی تۆ،

لەتاو عیشق و دڵسۆزی تۆ،

من چی بڵێم...هەرچی بێژم هیشتاكەمە ،

هەرچی بڵێم ...ناگا بەئاستی خەباتت،

لەچاو قوربانیت ئاستەمە.

هەرئەوەندە ماوە بڵێم :

لێم ببورە،لێم ببوورە.

ل ێ م ب ب وو ر ە

٢٠٠٦ كەركوك

## چەپکە نێرگز ★

لەگوندێك دا..

لەنێو چوارچێوە قوڕینەی،

خوێندنگایەکی بچکۆڵە ،

چەندخوێندکارێکی ژیکەڵە

راوەستابوون .

چاو یان لەئاسۆ و فڕۆکە ،

چاوەڕوانی مامۆستا بوون.

– کاوە وتی :

بەهار وەرزی شادی ژینە

پشکۆ وتی :

وەرنە ئارانی هەناوم ،

هاوین... بەڕاستی هاوینە .

-ئارام وتی :

بە گەلاڕێزانی چنارو ....

رەنگ زەردی وخەزان دەزانم ،

پایز ...وەرزی هەڵوەرینە

- زریان وتی :

کەبەرگی هەزار دەدڕێ،

بە دەنگی باوکم دەزانم ،

زستانە ،سەهۆڵبەندانە ،

سەرمایە...بەفر بارینە .

لەدوای ڕۆژباشی مامۆستا،

- شیعرم وتی :بەچوار وەرزە ...

لەهەر چوار پارچەی دڵی من ،

پشکی زەوی سك سووتانە .

گوند لەدوای گوند ..

وەك خەزانە .

دایك ..بۆنكروزی لێ دێ،

هەڵقرچانە .

بەڵام ئەوەی شانازی یە ،

نەبەزینە ،کۆڵنەدانە....

ئەنجام ڕزگاری گەلانە .

هۆ گوندەکەی بەهەوری غەم داپۆشراوم !.

چاودەبڕمە،هەرلووتکەیێ،

هەربنارێ..وەکوتۆیە.

هەرگەردەلوولە ودووکەڵە،

هەر بۆن سۆیە .

هۆشەهیدە ژیکەلەکەی ،

دەرگای وشە لێ داخراوم،

تۆ تەنیا نی .

تۆ میوانی(قەڵادزێ)و(قۆڕیتانی).

تۆمیوانی شەهیدانی،

چەوساوەکانی جیهانی.

تۆ تەنیا نی.

لەنیشتمانی پرپیت وئاوەدانی.

لەوڵاتی ئاگرباران و گرانی .

وا بە تاسەی قەڵەمەوە،

سەری بەرزی خۆت نایەوە .

ئێوە مۆمن..

درێ بەتاریکە شەو دەدەن ،

چرایەکن ....ناکوژێنەوە.

**ئێوه ئەو(چەپکە نێرگز)ەن ،**

**نێوبیری کرێکاراندا،**

**لەنێو باغچەی  هەژاراندا،**

**هەتا  هەتا دەژێنەوە.**

**١٩٨٥ دەشتی کۆیە**

---

⋆ بەهاری ١٩٨٥  لەگوندی (خە رابە بووم.مامۆستانەعمان مامۆستای شۆرش بوو داوای لێ کردم کەکۆبوونەوەیەك بەمنالاّن بکەم،لەپڕدوو فڕۆکەی(پیلاتۆز) پەیدابــوون وکەوتنە ئاگربارانی گوندەکە،لەئەنجامدامنالێك بەناوی(مکاییل) شەهیدبوو .منیش هەربەو بۆنەیەوە ئەو ڕۆژە ئەم شیعرەم نووسی ودواتر پێشکەش منالاّنی قوتابخانەی گوندی (خەرابە) م کرد.

⋆لە ئاهەنگی نەورۆزی ١٩٩٠دا لەکوردستانی رۆژهەلاّت لە لاین ئومێدی کوڕمەوە خوێندرایەوە و بە کامێرای (هێرۆخان ) تۆمارکرا

## پشکۆ

بۆ/ شەهید لقمان أسعداسماعیل ناسراوبە (کارزان) *

پشکۆکانی ئاگری نەورۆز

هێشتا لەسەر لووتکەی چیاکان..

گەش گەش مابوون.

لەگەڵ هەتاو

جووتێ هەڵۆ

لەشاخی دەربەند ئاوابوون.

تاشە بەرد ی ئەوبنارە

گشت شاهیدوئاگادارە.

ئەم تێکۆشەرە (کارزان)ە

لەگەڵ هەڤاڵە ئازاکەی

بۆگەل چەندە بەوەفابوون.

١٩٨٥

---

* کەلەرۆژی ١٩٨٨/٣/٢٢ لەگوندی هەنارەشەهید بوو

ئەوا هاتووم ..

وەکو(صۆفی) وەك(دێوانە).

کرنۆشی ڕێز بەرم بۆخاك.

نەکەن من بەدین بزانن!!،

نەخەرقەم هەیە،نەسیواك.

من نامەوێ باسی ئەفسانەتان بۆبکەم،

هەتابەرچاوتان لێڵ بێت و...

لەبیرتانچێ پیاوی ناپاك .

فەرموون لەگلێنەی خامەوە ،

لەئەلبوومی پەیامەوە .

لەسایتی گریانەوە .

لەکلاورۆژنەی ژانەوە .

بتان بەمە دنیای سووتماك.

( ١ )

تەماشاکەن ...!

لەولای(برایم سەمین)ەوە .

بەپاڵ چیای(حەمرین ) ەوە:

ئەو ە ...! ئاوایی(نارێن) ە.

بەدەشتی کاکی بەکاکی گەرمیانەوە.

ئەوە ...! خەنجەر و پشتێنە.

بەرۆخی زێی ( سیروان )ەوە.

هەتا دوێنێ

گەردی بەرپێ ی ئەسپی شۆڕش

سوورمەی چاوی کچانی بوو.

کەچی ئەمڕۆ..

ئەویش بووە بە(خەرابە)،

کوانووی پشکۆ .

وەك دەوروپشتی(خانەقین)،

وەك( تیلەکۆ).

**وەکو(چراغ )،**

**وەکو(شـــیرناو)،**

**وەك( گەرمك )...بۆتەژیلەمۆ .**

**( ٢ )**

**تەماشاکەن ....!**

**بەسەر(گردێکی سەوز) ەوە،**

**پێشمەرگەیەك..ئێستا،**

**پەیکەری هاواری(گۆپتەپە)یە.**

**ئەمە ..پۆ ستەری(خەزان) ە .**

**ئەمە ..!وێنەی(رەندی خان) ە.**

**ئا لێرە بوو ..!**

**بەرۆخی زێی(دوکان)ەوە.**

**بەبەرچاوی هەمووفریشتەکانەوە.**

**سەدان چرای چاوخامۆش بوون.**

**سەدان باڵە پەپوولەی جوان.**

**هەڵپڕوکان....**

چۆن پێنج هەزارئەستێرەی سوور.

لەئاسمانی(هەڵەبجە)وە،

داچۆڕان وبوون بەکۆی نوور.

ئاوا..پۆل پۆل رۆحی مەزن ،

شەمچەی بچووك...

هەڵکشان بەرەو کاکێشان ،

بەرەوهەسارەکەی(کەرکوك).

بۆ پایتەختەکەی(شارەزوور).

( ٣ )

ئەمە کوێ یە ...؟!

ئەمە ..تابلۆی هەڵوەرین وداچۆڕانە.

ئەمە(قەڵای سەڵت ئەحمەد)ە،

(خاڵخاڵان)ە.

ئەمە ..شیو ( هەنجیرەزەرد)ە

ئێرە مەملەکەتی خەفەت ،

دوامەنزڵگەی دابڕانە .

تەماشاکەن ...!

تەپ وتۆزێك بەری هەتاوی گرتووە .

ئەوە ئەنجامی هەرەس وبورکان نیە.

ئەوە گڕ و تۆفان نیە.

شۆفەلێکە..

گوندێکی بەرکەڵبەداوە .

بەدامێنی ئەوگوندەوە،

چەند کەژاوەیەك وەستاوە .

کەژاوەی چی ..؟

چەند ئیڤایەك ....

خەڵکیان تیا شەتەك دراوە.

ئەرێ ..؟ئەمە تەکنەلۆژیاو پێشکەوتنە.

یا دارە بازەی مردنە ؟

ئەرێ ئەمە مرۆڤــ دزە ؟؟

یاکاروانی کۆچێکی بێ سەروبنە؟

بەسەرپشتی ئەم گالیسکە نەگریسەوە،

(مامە ئەحۆل)ی(چوخلیجە)،

ڕدێنی تۆزاوی بووە،حەپەساوە.

(پورە زەوە)ی(گردخەبەر)ی

دەسپێچکەکەی،

پرچە سپی یەکەی خۆیەتی

لەزەند وباسکی پێچاوە.

بەهەزاران(مەم)و(زین)و

(خەجێ)و(سیامەند)...

پێش ئەوەی بگەن بەمراز

ببنە بووك وببنە زاوا.

ڕاپێچ کران بۆ ( قۆرەتوو)،

بۆ قەسابخانەی (تۆبزاوا)..

(٤)

ئەمە وێنەی پێدەشتێکە ،

تەلبەندێکە.

وەك دۆڵەدانی ئاش وایە ،

خەرەندێكە.

دیوارێكی تەلیسماوی،نهێنی یە...

ئای...! چ داووكەمەندێكە.

گۆڕەپانی جیاكردنەوەودابڕانە.

پیران بەجیا،

منالْ بەجیا،لاوان بەجیا....

ئێرە دەشتی كورد قڕانە.

تەماشاكەن !

ئەمە ..ئاوێنەی دوا ڕۆژی منالْێكە.

تەمەنی پێنج شەش سالْێكە.

وا جەلادێك دەستی راستەی ڕادەكێشێ ،

پێی لەسەر لێوی چالْێكە.

دەستی چەپی لەنێودەستی دایكی دایە،

ئای دایكی چ كەژالْێكە.

ئەرێ. . ئەمە جۆلانەیە ،

یا كایەو یاری كردنە ؟؟

ئەرێ .. ئەمە ڕاژەندنە ،

یادارکێشەکێی مردنە؟؟

لەنێوانی کەڵبەیگورگ و

کزەی جەرگ و بەزەیی خوا،

منداڵەکە،بستی دەمی داپچڕاوە.

( ٥ )

چوار ڕیانێکە ،کارەساتە.

ئێرە ڕێی هات ونەهاتە.

لە چەقۆ وگوێزان تیژترە،

لە داوە موو باریکترە.

لە شەوە زەنگ تاریك ترە.

ئەمە وەك پردی سیراتە.

ئەگەر لێرەوە بڕوانی؟

ڕەزە زەیتونێك دەبینی،

سەدان نیگای ماڵئاوایی

بەقەدیانەوە ڕواوە.

بەوبەرەوە....

گردۆلکەیەك لەنۆژەن دروستکراوە.

ورد ببنەوە...!جێی ڕامانە.

پارچە پەڕۆی دەرپێی ژن و

سوخمەی کچ و کەوای مەلا....

لەدارتەل ولە دڕکەزی و

لە کێلی قەبران ئالآوە.

من دڵنیام ئەم گردۆلکەو کەل وپەلە.

سێگۆشەی بەرمۆدانییە.

جێی توڕەیی خودانییە.

یاتاقیگەی چەکی میکرۆبی وخەردەلە.

یا جێی کارێکی چەپەڵە.

یاخۆ گۆڕی بەکۆمەڵە....

(٦)

(نوگرەسەلمان)

گێژەنێکی مرۆڤلووشە،

زیندانێکه ...

خۆی بۆخۆی مەرگستانێکه .

شازده هەزاربالّی هەلّۆ..

لێره شکا .

لافاوێکه ،

کاروانسەرای کاروانێکه.

بەهەزاران نزاوتکا .

به ئاسمان وبن مێچیەوه هەلّپڕوکا.

ئای ئەمه چ ویژدانێکه ..

لوولەی تفەنگ و..نێوچاوان .

قوڕگی تاساوو پڕگریان .

ژووری تاریك و تێهەلّدان .

چ قیامەتێ هەلّساوه .

له نێو هۆلّ و ...

بەردالأنی ئەم زیندانه.

لەولاوه ...تەرمێك راکشاوه.

لەم لاوە ...

شێتێك گیان دەدا،

بەدەم گریان و نزاوە .

لەولاتریش ..

کت وکوێرێك دۆش داماوە .

لەبرسان دا،

ڕەگ وتۆوی فریزدەکوتێ..

تاوەك قاویت ..

لووشی بکات لەپەناوە.

(٧)

گەرمەسێرە،دەشتێکە چۆڵ وبیابان ،

سەرابێکە ، هەڵقرچاوە .

تاچاوی مرۆڤـــ بڕوانێ،

وشکایی یە،بەبێ ئاوە.

لەو ولاٚتی غوربەتەدا ،

هەردوودەستەلەرزۆکەکەی(مەلافاتیح)

ئەو دەستانەی بۆبانگ دەینانە بناگوێی،

ئەودەستانەی،

کتێب وقورئانیان دەگرت

لەگەڵ لاشەی رەق وتەقی(مام تۆفیق)دا

بێ گۆڕوگۆڕیچکەو تەلقین...

قومیان بەسەردا کراوە.

کەپکەشاخ،تەپە و هەڵدێرە.

لە،ئاودرە،تاوێرە،

نانی تاڵ وئاوی شوێرە.

لەو شوێنە بێ حورمەتەدا .

سەگێکی ڕەش وەرکەوتوو وە،

چاوی ...لەدەرگای زیندانەو...

گوێ ی بۆگریان هەڵخستوو وە .

(قەرە) فێرە ... هەمووجارێ،

لەجیاتی نان وکولێرە.

بەبەرچاوی(حەجاج)ی دەرگاوانەوە .

بەبەرچاوی جەلادوپاسەوانەوە.

دەستێ،لاقێ ،کەللەسەرێ...

مردوو بەکەرت وپارچەیی،

بێنێتەوە لەسەحراوە .

ئاخر ..بۆیە !!

دایکی(ئامانج)کەهاتەوەگێڕایەوە:

من و(رەعنا)هەموو شەوێ،

لەخەونیش دا،

تەرمی یەکترمان دەبینی،

بەدەم سەگەبەرەلاوە .

(٨)

هۆشارەکەم ..!

هۆ هۆ ڕۆگەی کوردستانم .

هۆ گوندەکەم ..!

هۆ هۆکۆگەی سەدان یادگاری ژیانم.

هەمووسالێ، لەبەهاردا،

لەگەڵ گرمەگرمی هەورا،

گوێ لەناڵەی منیش بگرن !

من ..گێراوێکی (ئەنفال)م،

زۆردارەکان لەسامان وماڵیان کردم.

خوێنیان مژیم ،

پێیان لەسەرئابڕووم ...دانا.

لەژن ومناڵیان کردم .

لەو دەشتە چۆڵ وهۆڵە دا

تووشی مەرگی تاڵیان کردم .

پاشان زیندەچاڵیان کردم .

من گێراوێکی(ئەنفال)م

تیشکی چاوی عاشقێ بووم،

مەعشوقەکەم بەجێ ماوە.

من گولاڵەی بزورکاوی،

خەون وهیوای گێراوێك بووم .

نازانم دوای ون بوونی خۆم،

دڵدارەکەم ...

دایك وباوکە هەژارەکەم .

مردن بەدەم کام ڕێگاوە.

هاتوومەوە ،دڵنیابم ...

چییان لێ هات کۆشێ مناڵ،خێزانەکەم .

کوان باپیرەو داپیرەکەم .؟؟

کواخزمم ، کوا جیرانەکەم .؟؟

کوا سەرکانیم ،کوامزگەوتم ؟؟

ئەدی کوا قوتابخانەکەم .؟

هاتوومەوە دڵنیام کەن

ئازیزانم لەکام جێگان؟

لەکام ولاتدا ئاوارەن ؟

لەکام مالا خزمەتکارن؟

لەکام شارۆچکەو ئۆردووگان ..؟؟

★★★★

هۆ خەڵکینە !

من نەوەی ئێسك وپرووسكی

ئەشكەوتەكەی(شانەدەری) م

من خەڵكی(چەرموو)ودێی(زەرزی)م

من ئەوگەلەم دوای هەزاران لەشكركێشی ..

هەروا زیندووم .

ولاٚتم ..كانی خێراتە ،

هێشتا خۆم خێرم پێ دەشێ..

لەزستاندا بێ ئاگرم.

پاشماوەم دەگا بەكەنداو..

وا خۆم لەتێنوان ..دەمرم .

ئاخر بۆیە..وەكو مەلی هەڵكورماوم .

وەك پەپوولەی باڵ سووتاوم.

كەی رەوایە هەموورۆژێ....

بەسەر درکەزی پیلان دا،رام دەكێشن.

سنوورم لێ دەبەزێنن،

(كیمیاوی)م پێدا دەكێشن.

کەی ڕەوایەهەمووسالێك وەك(برایم)...

لەئاگردا دەسووتێندرێم؟؟ .

وەکو (مەسیح)لەخاچ دەدرێم.

کەچی هێشتا هەرزیندووم و

هەر زیندووم و زیندوو ترم.

زوڵم وزۆرو چەوسانەوە ،

ئۆقرەو ئارامیان بڕیووم.

چی بکەم ئەگەرخەبات نەکەم ؟

چی بکەم ئەگەرهاوار نەکەم ؟

چی بکەم ئەگەر ڕانەپــەڕم ؟

چی بکەم ئەگەر مان نەگرم ؟

هەولێر١٩٩٣

---

*ئەم شیعرە لە(هۆڵی میدیا)ی هەولێرولە (گۆپتەپە)و لە(کەرکوك) خوێندراوەتەوە

## ڕاگواستن

لەنێو جەرگەی تەپوتۆز ودوکەڵەوە.

لەنیشتمانی سووتماکی

بەردەم چەقۆی شۆفەڵەوە.

بروسکەیەك بەڕێ کرا،

بۆبارەگای زل هێزەکان :

ئەی ئەوانەی مافی مرۆڤ دەپارێزن.

گەر ئێوە ڕاستی دەبیستن،

ئەگەر بەتوانا وبەهێزن؟.

بۆچی لەسەرکوردی هەژار ...

نایەنە دەنگ ؟

بە(کیمیاوی)دەمانکوژن،

نیشتمانمان داگیر دەکەن.

بۆ بیابان و گەرمە سێر،

بەکۆمەڵ ڕامان دەگوێزن.

١٩٨٦خۆشناوەتی

ماڵەی رووناكبیری وكۆمەڵایەتی كەركوك

بەشی روناكبیری



- ٤ -

# شیوەنێك بۆ ڕەندیخان

## مەلاشاخی

شیعر ١٩٩٩/٥/٣

رۆژێ.. له قه‌لاّسێوکه دا

له‌گه‌ڵ پیرێك کۆبوومه‌وه‌،

پرسیم چۆنی ؟

وتی:رۆڵه‌..!

من نازانم هه‌تا ئیستاچۆن ژیاوم،

بۆ نه‌مردووم .

چه‌ندساڵێکه له‌شکری خه‌فه‌تی ئه‌نفال

قه‌لاّی پایته‌ختی ئه‌م دڵه‌ی داگیرکردووم .

★★★

به‌بیرم دێ ...

به‌یانی زوو ته‌ته‌ره‌که‌ی ماسقه‌لان هات

وتی : په‌یامم هێناوه‌..

بروسکه له‌(دێده‌وان )ه‌وه‌ :

زووکه‌ن ئه‌ولاتان گیراوه‌..!

له (سارا) وه .. :

له‌پایینم سوپای کولله مۆڵ دراوه ..

شێخێك له(دارەگەلی)یەوه

سوارێکی نارد..:

رێگای دەربەند داخراوه .

نامەی شاریش گەییه لامان :

رەشەبا ..هابەرێگاوه .

گەردەلوولە..گەردەلووله

ڤایرۆسی قڕان دەهێنێ .

هەر کەسێك دەمامکی نەبێ،

شەوەی خەردەل دەیخنکێنێ .

★★★

بەبیرتان دێ..؟

پاش نیوەڕۆ(سەنگەر)ووتی:

تەنیا چارە بەرگری یه !!

(رێبوار) ووتی :

له یەکێەتی گەل بەولاوه،

چارتان نی یه !!

بەبیرتان دێ..؟

لەسەر پلەی بەردەعەلی

شیعرم ووتی:

تا ئێوه ئاوا ناکۆك بن ،

دەسپێچکی ژنتان خەفەت و..

ریسی پیاوانتان  خوری یه .

بەبیرتان دێ ، ئێواره بوو ..

گردەکان لەبەر چاومان دا ،

لەجارانی نەوی تر بوون.

لوتکەکان کورته بالأبوون ،

تیشکەکانی خۆرەتاویش،

وەك پرچەکەی

دایکی شەهید(مەلائارس)

تێك ئالاّ بوون .

★★★

ئای ئەورۆژه چ رۆژێك و..

چ ویستگەیەکی سامناك بوو.

زێ کش ومات ...

شیوه سووریش هەر وەکو من ،

دلگیروزیزو غەمناك بوو.

گۆپتەپە زامەکانی خۆی دەکولاندەوە .

عەسکەر بۆن سۆی لێ هەڵدەستا..

زەردە پەڕ بوو .

ئاسمان کردی بە ناڵەناڵ،

گوێمان لەدەنگی کەڕەنا و

لەگرمەی دهۆڵی شەڕ بوو.

هاواریان کرد:

ئەنفال ..ئەنفال ...

ئیتر گوێ ی ئەهریمەن کەڕبوو.

★★★

باری  باری ...مەرگ باری .

بوو بەشەوی ئەنگوستە چاو

هەورازی هەناسەسواری .

دێوی تاوان زریکاندی ،

ئەنفالی هێنا بەدیاری .

★★★

باری ..باری .

تەرزە نەبوو ،بەردبوو  باری .

گەواڵەیەك(سەرچنار)یشی گرتەوە،

بەسەدان لقە زەیتون و...

چەپکە نێرگزی تێکشکاند.

بەهەزاران ئاه ونزای ...

بەئاسمانەوە ..پرووکاند..

★★★

لەو کاتە پرئۆفانە دا.

ئا لەگەڵ ئەم تۆفانەدا.

سەدان رەزو باغ و بێستان .

بەسەدان چەم و دارستان ،

بەدەیان هۆزان وداستان.

لەگەڵ تەبارەی گەنم و...

خەلەو خەرمان ،هەمووسوتان.

هەر لەگەڵ ئەم زریانەدا ،

بەهەزاران کۆترە شینکە ..

لەهێلانەی خۆیان تاران .

فرین ..فرین ،

بەرەو چیای خاڵخالان فرین .

بەرەو لووتکە بەرەو بنار.

هە تا دەربازبن لەئازار.

ئە نفالی چوار بووبەڕەشمار..

بووبەگورگ وئەژدیهای هار .

بووبەگێژەن ..

زۆربەی ئەوانیشی لوول دا

بەرەو چارەنووسی نادیار .

بەرەو گەرمەسێری بردن .

١٩٩٩/٥/١سلێمانی

---

★ لەیادی کیمیابارانی(گۆپتەپە) دا لەرۆژی ١٩٩٩/٥/٣ لەلایەن شاعیرەوە خوێندرایەوە ،وەك نامیلکەیەك لەلایەن بەشی رووناکبیری(کۆمەڵەی رووناکبیری کەرکوك)ەوە دابەشکرا.

# سێ وێنە

لەئەلبوومی شەهیدانی گۆپتەپەدا
سێ وێنەیان پێ نیشاندام..
لەسەربەرگی کتێبێکدا،
سێ شاهیدن،
هەرسێ (عومەری خاوەر) ن.
بەلاَم ئەوەی لەناخەوە دەمسووتێنن
سێ پشکۆی ئاگری سوورن،
لەنێو سینەو دلّی مندا
وەك پۆلووی نیًو( سەماوەر) ن.

## وێنەی یەکەم :

کەللەی سەری شەهیدێك بوو
لەهەرهەموو وێنەکانی تر جودابوو.
کاتێ کەلێی وردبوومەوە..
پڕ..پڕ لەنووری خودابوو.
خۆ ئەو زرکە کالّێك نەبوو..!
لە سیمادا ئاشکرا بوو

مامۆستا بوو.

چەند ساڵێك بەر لەشەهید بوون

لەمزگەوتەکەی ( کڵێسه ) مامۆستا بوو.

خۆ ئەو ئینجانەی گڵ نەبوو

تەژی تەژی لەدلێری وئازایەتی .

له خۆشەویستی هەژاران ،

له عیلم وله کوردایەتی.

ئەو خۆی (تفسیری قورئان) و

راڤــەی کتێبی پیرۆز و

چیرۆکی پێغەمبەرانی

سوره تی ( أنبیا ) و (هود) بوو .

بەڵێ بەڵێ ناسیمەوە...

وێنەی کەللەی هاورێکەم بوو

کت ومت ( مەلا محمود) بوو.

## وێنەی دووەم :

پێشتر له قوتابخانەی شۆڕشدا

چرایەك بوو داگیرسابوو.

لەدوای ئەنفال کش ومات و حەپەسابوو.

تەماشاکەن !

لەلێواری چاڵێکدایه .

جارێ ئارامی لێ دەبڕێ و

جارێکی تر مقەببایە.

چنگی پڕکردووە لە ئێسك و

لێوی خەریك شەنەبایە.

( چۆن جیا دەبنەوە ..خودایە..!؟ )

دەروونی پڕ لە پشکۆیە.

- ئەمە  وردە جمگەی پەنجەی کاکە ( توانا) و

ئەمەیش پەراسووی ( شکۆ ) یە .

ئا ئەوانەیش کە وەك مێوژە رەشکە.. جوانن.

گلارای چاوی ( ئایشە خان ) ن

ئەوانی تریش  گلێنەی دوو دییەی (تاڤگە )و

دەنکەمێرووی ملوانەکە شینە ی (تابان) ن.

**وێنەی سێیەم :**

منالێکی حەوت سالانە .

جێ راوگەی ئەو نە قەندیل و

نە  ژیلوان و چەم رێزانە

(چەمە خڕکە) و ( رەندیخان ) ە

نێو رەزەکەی بەرمالانە .

ورد ببنەوە...

ئەم پێشمەرگە بچکۆلەیە ..!

( قارەمان )ە

چەندساڵ لەدوای شەهیدبوونیش

شوین کەمینی بەرنەداوە.

تا ئیستایش دارلاستیکەکەی

هەرپێیەو فرێی نەداوە

دەزانن بۆ ..؟!

پێمان دەڵێ :

(هەرچی ئەنفالی لەبیرچێ ،

هەرکێ ریسمان بکات بەخوری،

خەڵکینە نەفرەتی لێ بکەن

بەخوا هەقی بەرد بارانە .

کلێسە ٢٠٠٩\٥\٢

---

٭ لەبیست ویەکەمین ساڵیادی ئەنفالی چواردا لەکۆبوونەوەیەکی جەماوەری فرەواندا

لەسەر مۆنومێنتی شەهیدانی گوندی کلێسە خوێندرایەوە

## داستانی ئاوارەیی

هێشتا جۆ گەلەی خوێنەکان

لە (قەندیل)ولە( فاو )ەوە...

دەرژانە...(کەنداو) ەوە.

بەگوێی دنیایاندا چپاند.

گووتیان:ئێمە ئاشتی خوازین.

هێشتا شەپۆلی دەنگەکان،

دەزرنگانەوە لە ئاسمان.

سنووری ڕاستیان بەزاند .

هێشتا رەنگی نووسینەوەی بەڵێنەکان،

وەك فرمێسكی دایكی شەهید،

تەڕبوون و دەدرەوشانەوە،

پەڕوباڵی كۆتری سپیان هەڵوەراند.

هێشتا بڵند گۆی درۆیان،

بانگەوازی ئاوەدانی ڕادەگەیاند.

كوندە پەپووی شومی شەڕیان،

لە سەرهەزاران كەلاوە،

وەك قەلە ڕەش دەیان قڕاند.

لە(گۆپتەپە )ی سەرقافڵەچی وێرانەیی،

لە(ڕەندیخان)

لە سای هەواریماڵێكدا،

كۆرپەیەكی ژیكەڵەی جوان...

بۆ بینینی دنیای( ئاشتی)،بۆبەختیاری،

دووچاوی شین،

دووگۆمی مەنگی شڵەقاند.

زۆربەنازو كوێرەوەری،

کەوتە ڕێگا بەرەو ژیان.

گوندی بەئاوایی نەدی،

یاری بەقەڵەمێ نەکرد،

مامۆستایێکی نەدواند.

گەردەلوولی چەکی کوشندەی(کیمیاوی)

لەگەڵ گەڵای دارەکاندا...

قەدو باڵای هەڵپڕوکاند.

★★★★

شەوێ تاکو نیوە شەوێ.

چاوی خەواڵوم نەچووە خەو .

بۆبەیانی  پێش ئەوەی هەتاوبکەوێ .

تەتەر وەك بروسکە ئەهات

کێ ئازایە فریاکەوێ !

هەواڵ گەییە هەمووما لێ:

کەس نەسرەوێ .

کوللە زەردەی عەفلەقیەکان،

بۆسەرمەزاری ئەم میللەتە،

هێرش دێنن.

بەفەرمانی رەشەبا دێن،

تەڕو وشك دەسوتێنن.

كاتێ هەتاوتیشكی زێڕینی دابەشكرد

داڵەكەرخۆری بێ ویژدان،

كەوتە ئاسمان .

بەسەر خەڵكی (قەڵاسێوكە) یقارەماندا.

تەزرەی مردنیان دابەراند.

★★★

هەرئەورۆژە...

لەبناری(كۆسرەت)ەوە،تا( دێدەوان).

لە(دەربەندی بازیان)ەوەتا(خاڵخاڵان).

لەجێ شەرگەی (قازان)ەوە،

تا(چەم رەزان).

پەل ورەگی پیرەدارو،

قەدو باڵای نەونەمامیان

لەگەڵ جمگەو دەست و قاچدا،

لە زنجیری تانگ دەئاڵاند.

★★★

مۆڵەتم دەن تابپرسم:

ئەرێ زەوی گریانی دێ ؟

ئەوەنی یە وائەم خاکە

جەرگی دەسوتێ .

ئەوەنی یە وا ( دوکان )یش

فرمێسکی دێ .

لەتاو خەمی سوتانی ( دێ).

ئەوەنی یە...

زێد لە ساڵان

شۆڕاوەی هەور شۆربۆتەوە

بەرەو هەوارگەی هەژاران.

هەرچی بوار بوو نەماون،

بۆپەڕینەوەی شەتاوان.

ژێر توتڕك‌و پیرە دەوەن،

سەنگەرن بۆ لێقەوماوان.

★★★

ئەم وولاٚتە قارەمانە...

گشت خەلٚکەکەی

وەکو خەلٚکی شاری مردوو خۆرەکانە.

ئەم وولاٚتە.

پڕلەغەم‌و کارەساتە،

رۆژێك نی یە،

کەبەدەیان نەتوان و شەل...

دێوانە و شێت.

کۆرپەی ساواو گەنج و پیری،

بۆبیابان ڕاپێچ نەکرێت.

کەچی هێشتا لە ترۆپك‌و

ئەشکەوت و چەم.

لەهەڵەت و لێرەواردا.

دەنگی سرودی (نابەزین)،

بەرەو کاکەشانی فەلەك بەرزە وابێت

★★★

ئێوارە بوو...

بینیم کاروانێ کەوتەڕێ .

سەرقافڵەچی لەکۆتایی بێ ئاگابوو

نەیدەزانی بۆسبەینێ،دەگەن بەکوێ.

ڕێگا.. تاریك وباریك بوو،هەورازو لێژ،

لەپێ دەشتتەوە بۆبنار.

لە لووتکەوە بەرەونسار.

بەستی( شەڵغە)و(شیوەسور)یش

وەك(قۆپی قەراغ)و( زەردە)

بۆهەزاران،خەڵکی ئاوەرەو ماڵ وێران

بوو بونە ماڵ و دەرەتان.

لەوێشەوە کۆچ وکۆچبار،

بەرێ خران بۆ شاخو شار.

قامیشەلآن و هەردە وچۆڵ .

کەندو لەندوئەشکەوت و دۆل.

بوون بە حەشارگەی کۆل بەکۆڵ.

بن بەرد نەما،

نەبێتە پەسێوو بنکۆڵ .

کە گوێم هەڵخست لە دایکێ ،

بەسۆزەوە کۆرپەکەی دەلاواندەوە.

بەردیشی دەتاواندەوە:

(رۆڵە لای لایە...

کۆرپەم لای لایە.

چەند هاوار دەکەم دەنگم دەرنایە .

کوردستان سووتا،کورد ئاوارە بوون

هیچ کەس بەهانای ئەم گەلەنایە).

★★★

لەماڵی شیعر بەولاوە داڵدەم نی یە

پەنا بۆشوێنی دی نابەم.

ئەگەر چیرۆك نووس بوومایە

ئەوەی لەم کاروانە بینیم

هەمووم دەکرد بەرۆمانی.

ئەگەر نیگارکێش بوومایە

تابلۆیەکی وام ساز دەکرد

لایێکی دنیام دەهەژاند

بەکارەساتی(هەڵەبجە)و(شێخ وەسان)

(زیوە)و(بادینان)...بزانێ.

★★★

رۆژە ڕەش بوو

خزم لە بڕبڕەی پشتی ترازابوو.

برا برای جێ هێڵابوو

کۆرپەی ساوا، بەدەم ڕێوە،

چاوی بۆژیان هەڵێنا بوو.

ژن لە مێردی،

خانەوادە کەس وکاری،

وەکو زستانی ڕابردووی شاخی (ژیلوان)

وەك سەرماکەی سەری(ئاسۆس).

هەرهەموو لێك دابڕا بوو...

باوکێکم دی سەرگەردان بوو

تەواو سەری لێ سوڕما بوو.

پڕ بەزاری بانگی دەکرد:

بۆکوێ کەسم بخەمە ڕێ ؟:

بۆسەر شۆستەی شەقامەکان،

یابۆ ئەشکەوت وشاخەکان ؟؟

بۆشوێنی سبەی نۆرەی دێ ،

یابۆبەرپێی قەنارەکان.

کۆرپەکانم...

بچنە زێدی باوباپیرم(بابە گوڕگوڕ)

نانا مەچن ،میوانداری قەدەغەیە،

بەبێ پرسی بێگانەکان .

کۆرپەکانم ...بچنەپاڵ قەڵای دێرینەی،

شاری(هەولێر) !

نانا مەڕۆن !

چونکە سێبەری شك نابەن

مەگەر شەق و زللەبخۆن.

بۆکوێ دەڕۆ ن ؟

وەرن وەرن ، تەماشاکەن ..

لە نیو دۆل و لەپاڵ کەپکە شاخ و گابەرد

گەورە وبچوك لە تاوان بوونە گرمۆڵە.

ئێوەش خۆتان بشارنەوە.

تادەروویەك دەکرێتەوە،

ئەوجا چارتان دەکەین ڕۆڵە.

★★★

گەر هونەرمەند

دیمەنی دلگیری دەوێ.

بابێ لە گەڵ کاروانی شیعرم ڕێ کەوێ.

لەزستانی ڕابردوودا،

لەشاخی پشتی(سەفرە)وە.

چۆن منالّی برسیو ماندوو،

بەبەر چاوی پێشمەرگەوە .

بەدەستی داك وبابی خۆی،بەبەرگەوە،

دەكرانە گۆڕی بەفرەوە.

لە قرچەی گەرمای هاویندا

دایكێكی میهرەبانم دی،

سك لەبەردەم.

دڵ پرلە غەم...

شەش مندالّی بەدواوە بوو،

گشت پێ پەتی،

خۆشی بەتاكێ سۆڵەوە.

گەنجێكی بەویژدانم دی.

بەهەورازدا هەڵدەگەڕا،

لە تەلان دەهاتە خوارێ .

پیرە باب و
تویشە بەرەی پرلەنان و
چەکەکەیشی بەکۆڵەوە.
سەد خۆزیایە.
(یەڵماز گۆنای) بۆ بیستن و
بۆ بینینی، ئەم تاوانانە بمایە.
من دڵنیام دوا بەر هەمی ،
دە بووە ئاوێنەی ئەم ڕەوە.
تیشکی چاوی کامێرای دەستی هونەرمەند.
دری دەخستە ئەم شەوە.
تەماشاکەن...!
ئەم دیمەنە چەند حەزینە :
هەتا چاوبرکا دوکەڵە.
هەرچی گوندی بەجێ ماوە،
وەك كاریلەی بەرگورگە لە.
خوێندنگا و مزگەوت و خانوو،

له بەردەم کەڵبەی شۆفەڵە.

هەرچی ماڵێ نرخی هەبێ

تالآنی دەکەن بەپەلە.

(نەیروون) ی چی؟

(هیتلەر) ی چی..؟

غازی(فۆسجین)و(تابوون)

له گەڵ(خەردەل)دا تێکەڵە.

★★★

هەلاو...هەلاو...

له(سەفین)و(کەژۆست) ەوە

له(پانی سەر)و(مۆتە) ەوە.

بروسکه له دوای بروسکه هاتنه خوارێ .

بە(شوان)و(شێخ بزێنی) بڵێن:

بابکەن تەگبیری، کارێ.

(دەشتی کۆیە)و( قەلاّ سێوکە)،ئاگادارکەن.

هەتا رێگا نەتەنراوە بکەن چارێ .

شەوێکی ڕەش ،وەك ڕووی دوژمن.

تاریك  تاریك .. وەك ویژدانی،

قارەمانی (ئەنفال) ەکان.

بوو  بەقەلاّ بۆ مێر و ژن.

بەپالّ ڕایەلّی دڕك دا...

لەنێوانی چەند مۆلّگەوە،

پۆل پۆل بیّ چرپە تێپەڕبوین.

لەئارانەوە بۆ زۆزان.

یەکەم قۆناغ:

مەلّبەندی(سیّ )ی

سەنگەری(ڕۆکێتی تۆلّە)ی ئازەیەتی.

جیّ هەوارگەی میری سۆران...

مەیدانی مەردی  و  پیاوەتی.

جیّ ی نزرگەی چەوساوەکان،خۆشناوەتی .

خێلّی ئاوارە و پەرێشان،

لە پاش شەویّ .

بەرەو هەورازی(دەرە شێر)

بەرِێ کەوت ،تاسەرکەوێ .

دووەم قۆناغ:

سەرچاوەکەی(مەلەکان)بوو

بارگە داگیراوە لەوێ .

ماندوو برسی بەرِێزەوە.

هەموو بینمان نا بەزاری کارێزەوە.

پیرەمێردێك قنج و کارزان...

فێری کردین

چۆن گیرفانی تێرِکە پرِکەین

لە منالٚی ژیکەلٚەو جوان.

شارەزایێك، چاو ساغ مان بوو

شۆربووینەوە،

لە (کورِکورِ) ەوە بۆ (گولاٚن).

بۆ ئێوارە قۆناغی سێ یەممان برِی

(دارەبەن)ە چاوەرِوان بوو.

(دۆڵەڕەقە)پاش نیوەشەو،

میوانخانەی کۆچەریان بوو.

رۆژی دووەم، سێیەم،چوارە م،

لە هەڵ کردنەوەی کلاڤەی ئەو رێڕەوە،

چەند تازە سوار، لە ڕێ گلان.

چوار وەرزەی ساڵ هاتنە ڕێمان

(بەهار، هاوین، پایز، زستان).

سوارو پیادە، کەس نەبەزی.

تاسنوری(قەندیل) بەزی.

لە(شێخ ئایش)لەنێوانی ڕووباروشاخ،

هاواریان کرد:

ڕێبوار وریابە نەخزی.

پاش چەند قۆناغ،

لە دیوو نسێ ،

کۆچ لە خێوەتگا دابەزی.

دواهەواری پشودانە.

دەوار هەڵدەن کەس نەوەستێ .

باکاروانی ئاوارەیی،

لەم سێبەری گۆرستانە،

چەق ببەستێ .

★★★

دەخەڵکینە هەموو یەك دەنگ،

نەفرەت بکەن لە خۆفرۆشان...

لە خائینەکانی (دەربەند) و

پشتی ( وەرتی ).

تف کەنە چارە ی ئەوکەسەی،

بڕوای بەخەندەی دوژمن دێ .

ژیرو دڵسۆزو خۆڕاگر..

بەفیشاڵی،ڕژێمی پەت و سێ دارە ،

ناخلەتێ .

دێڵزی ١٩٨٨

---

★داستانی ئاوارەیی لەیەکەم ساڵیاد ی ئەنفال وکیمیابارانی هەڵەبجەدالەساڵی ١٩٨٩ دا چاپ وبلاّوکرایەوە.

# دێدەوان

پێشکەشەبەتێکۆشەری دێرین(مام کەریم زەردکی)

شوێن.. قەمیشەلانێکی چڕبوو

خانوو.. نێوچەم وئاودڕبوو.

لەپاش سووتماکی سەدان دێ،

ئەنفالی سێ چلەی چووبوو.

کەچی هێشتا بەدووبینایی کزەوە،

وەك جارانی بەپشوو بوو.

لەدوای دەیان هێرشی چڕ،

چاوشارکێ لەگەڵ کت وپڕ.

ورەی گەلێ بلند تربوو.

ئەورۆژەیش وەك رۆژانی دی،

لەبن کەولێ،لەنێوتەنگێ.

خۆی حەشاردا تا درەنگێ.

ئێوارانێ بەتەپەتەپ گەیشتەجێ

وتی: هاتووم بمخەنەڕێ.

منیش با بچمە سەفەرێ.

دەڕۆم هەتا دڵنیا بم ،

هاوڕێ ی ژیانم ..کەوتۆتە کوێ.

خۆر لەزەردە،ڕێگای هات ونەهاتی گرت،

لەگەڵ کاروانی پێشمەرگە.

هەر ئەوشەوە،لەسەرپردی حاجی وسوو.

دێدەوان یش چاوی لێ بوو.

کەوتنە نێو داوی بۆسەوە ،

چوار کەناریان بوو بەئاگر

ئەوانیش هەر بەگڕی سوور ،

تەیمانی دوژمنیان بەزان ..

بەسەر مردندا بازیاندا .

هیچیان بەتەپکە نەگیران .

ئاسۆگەیێ دووئاسۆگە ،لێك دابڕان .

پاش دەیان جار

هەڵدێران وهەڵسانەوە.

ماندووبوون و حەسانەوە.

ئەوشەوە هەتا سبەینێ،

لەبێشەیەکدا دەمینێ.

کەرۆژ هەڵدێ..

بەگاڵەی دووژمن دەزانێ،

هەموو لوتکەکان گیڕاون

بەناچاری  دەچێتەنێو کەندەلاَنێ.

لەولایشەوە ..

هیچ کەس هەواڵی نازانێ.

رۆژدێ و دەچێ.

وردە وردە لێوی چەمیش

وەك لێوی ئەو هەڵدەقرچێ

پاش ( ٢١ ) شەوجودایی.

دابڕان و بەتەنیایی .

دوای پرسەو سەرخۆشی دۆستان.

دوژمن رۆیی و مل خۆی شکان .

ئەم هەڤاڵیش دێتە دەرێ لەنێوچاڵێ.

تا بەدەست بێنێ هەواڵێ .

لەولایشەوە دوورێبواری برسی وتێنوو،

دەچن بۆ نان ،دەچن بۆ ئاو.

دەدزنەوە ..(مامە)ی کەم بیناوپەشۆکاو.

کەدەپرسن ..لەو ماوەیە،چۆن ژیابوو،

بۆ نەمردبوو؟

جا دەزانن ..لەجیاتی هەموو خۆراکێ،

لەپەکوتێ..گیای خواردبوو..

کەهاتەوە..

لەسیمادا وەك برێشکەی بەرئاگربوو.

بەلاّم ..لەبیروبڕوادا

وەکو جاران خۆڕاگربوو.

دەشتی هەولێر ١٩٨٨

# داستان

گەرشاعیرێك خۆی بینیبێ ،

لەبەرشوڕاوگەی ئاگردا .

گەرشاعیرێك.

خەڵکی مشەختی دوونسکۆی دوواندبێ،

لەسەربەفرو .. ژێرچادردا.

گەرشاعیرێك هەگبەی غەمی ولاتێکی

دابێ بەسەرنەڕی شاندا.

بەشاخاندا داچوڕابێ،

هەڵگەڕابێ بەهەورازی تێکۆشاندا.

بڕوا مەکەن نەلێرانەو...،

نە لەخاکی گوێزان وخوێن.

لەهیچ شوێنێ

بۆ شیعرێکی ..دابمێنێ،

نەزانێ چی بکا بەهەوێن.

شەوگارێکی زۆرتاریکە

هەوری تاوان کوردستانی داپۆشیۆە.

رۆژگارێکی گرژو مۆنە

هەش بۆتەخەنەی نۆبووك و

دەڵێ ی خمخانەباریوە .

لەرۆژگارێکی ئاوادا....

هێندئازارمان پێ گەییوە.

گەرچاوێ..سۆمای نەڕژابێ ئێمەی دیوە.

گەر گوێچکەیێ کەڕنەبووبێ

هاوارمان پەردەی سمیوە.

لەقوناغێکی ئاوادا،پر سیار دەکەم :

لەو هەمووتاوانەدەکرێن دژگەلەکەم.

کامیان بکەم بەهەوێنێ

بۆئەم شیعرەم :

کارەساتی(ئەنفال)ەکان

یاشەهیدبوونی(هەڵەبجە)م ؟؟.

نانە ژەهراویەکەی(ماردین)،

یا دوا سەرنج بۆ گوندەکەم ؟؟.

فرمێسکی چاوی ئاوارەی(نوگرە سەلمان)

یاهاواری ژێرئەشکەنجەی

سەدەی بیستەم ؟؟.

خۆڵەکەوی زەوی سوتماك ،

یا دوانووزەی پیری کەنەفتی ژیان ئەستەم.

دوا دڵۆپی خوێنی(مامۆستای ئاشتیخواز)★

یا دوابینینی کیژەکەم .؟؟

نرکەی سروودی پێشمەرگەی ژووری زیندان

یا دوا نیگای هاوسەرەکەی،

بەبڕیاری(یاسای دارستان)ی سەردەم.

کردیان بە خۆراکی سەگ و

لەمەنجەڵدا، کردیان بەتەم ..

١٩٨٨بناری قەندیل

---

★ مەبەست شەهید (قاسملو) ە

★★ لەژمارە(٢)ی گۆڤاری(بانگ)دابلاْوکراوەتەوە

## شۆڕەبی

لەپاڵ گوندێکی وێرانە،

شۆڕەبی یەك وەك کچی شۆخ

پرچی بەشانەکردبێ.

وە ك بێریڤانێکی گراو

بەرەو ڕێ ی ڕان

بەلەکی خۆی هەلگرد بێ.

لەلێواری گۆمێکی مەنگ،

شین وەك چاوی کچی قەشەنگ،

تاکۆ ئەژنۆی چەقاندبوو

شنەی شەماڵی ئێواران،

نەسیمی فێنکی بەیان

هێند بالآیان هەژاندبوو

وەکو ڕێبوارێکی تێنوو...

وەك جووتیاری گوند لێ ونبوو..

تا چاوی حەزی تەماشام

بڕی کردێ، ورد بوومەوە:

ئاوی(ئاسۆس)و(دوکان) م

خوێناوەکەی لای(دەشتێو(و(شارستێن)م

تاکو زەندی تەزاندبوو..

وەك پاوانە وبازنە ومۆرو

قەوزەی کەسکی ،

لەگەردن وقۆڵ وباسکی، ئاڵاندبوو .

چاوەکانم وەك سمۆرە

بەقەد باڵای دا هەڵگژاند

ئەوجا زانیم ئەو نەشمیلە ،

بۆ ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو؟

چونکە پارچەی(ناپاڵم( ێك

کاکۆڵەکەی سوتاند بوو

قەڵاسێوکە١٩٨٦

رەشـەبا ★

هەرتۆمابووی ئەی رەشەبا...؟!

چیت دەوێ لێم...؟

هەر دەوارێکی شڕ شك دەبەم.

ئەویش خێرەو مەند،داویەپێم.

لەسایەی دا هەڵدەلەرزێم.

بە پاڵە پەستۆ تیا دەژێم.

گڤە گڤ چیتە لە بن گوێم.

بۆ وادەکەی ؟.

گەرەکتە لێمان بفرێنی .

یا ....کۆڵگەکەی بشکێنی.؟؟

ویژدانت بێ، ماران گەستم.

تۆ نازانی ، کەچەند پەستم.

لەشوێنی باو باپیرانم..

رایان گواستم .

وەرە گویێ بگرە لەمێژووم ،

لە هەڵبەستم :

لەشارو گوندی خۆماندا،

دەژیاین ...ژیانی ئازادی.

هەتاکو بڵێی بێ وەی بووین

بەلاَم دوژمن ڕەوای نادی.

بەناچاری ئاوارە بووین ،

لەترسی چەقۆی جەللادی.

چەند هەوارێکمان ئاواکرد،

ئۆردووی داگیرکەر سوتاندی.

ژێرشاخ وکەندمان هەڵدڕی،

(شۆفەل)ی هێناو تەپاندی.

پەنام بردە بەرمزگەوتێ ،

بەرشەپۆلی لافاو کەوت ....،

لەبنچینەوە روخاندی.

هانامان بردە بەرچەمێ،

چاوی بەد ...ڕەوای نەبینی

فڕۆکە.... ئاگری هێنا

هێشو هێشو

وەك ڕێژنەی باران باراندی.

سنووری سەر دڵمان بڕی

لەم هەوارە گیرساینەوە .

تەواوی نەحەساوینەوە.

تۆش ..لێرە لێمان ناگەڕێ ی،

بۆ کوێ بڕۆین ؟؟؟

چیت دەوێ لە ئێمەی غەریب ،

چیت دەوێ لەئێمەی ماندی؟؟

١٩٨٨ دێڵژی

*لەدوای ئەنفالەکان کاتێ بەخاووخێزانەوە ئاوارە ی (ئێران )
بووین لەیەکەم ڕۆژی پایز دا( ڕەشەبا) هەڵی کرد ،خیوە تەکەی
بەسەردا ڕوخاندین ئەم شیعرەم بەو بۆنەیەوە نووسی.

فەریکە حەزی ئاوارە

لیٚ ی مەگرن...

سەنگباران و لۆمەی مەکەن،

مەیدەنە بەرلیٚزمەی ڕق و...

ریٚژنەی توانج وتانە تان.

گەرمنالیٚکی هەژاروڕووت وڕەجاڵ.

گەرئاوارەیەکی،هەشت،نۆ،دە ساڵ.

بیٚ سەرپەرشت..

دەرچووولە ماڵ

لەبەرسیٚبەری تەلاری خواپیٚداویٚ.

لەگویٚی چەمیٚ،

لەدەم ئاویٚ.

چاوی کەوت بەبۆڵیٚ پەرسیلەی فەریك ،

مشتیٚ هەڵۆژەی توورت وکاڵ.

نیٚودەمی پڕبوولەئاوی،

مزروشیرین وترش وتاڵ.

لیٚ ی مەگرن..

مەیخەنەبەرگلەیی وڕەخنەی ڕووخیٚنەر..

لۆمەی مەکەن..

ئەمە دەقی(اعتراف)ی شاعیریٚکە،

لەدیوانی خۆشەویستی،

لەبەردادگای هۆزانیٚکدا

هاواردەکات:

گویٚم لیٚ بگرن..!

منی تەمەن ؛ چل،پەنجا..ساڵ.

رۆژیٚ لەبەرپەژارەی دڵ،

دەرچووم لەماڵ.

کەچی شۆخیٚك راوی کردم،

کەوتمە داوی سرکەنەشمیلیٚکی کەژاڵ.

بووم بەنێچیری نازداریێ،

بۆچنینەوەی مرواری هۆش وخەیالێ.

وەك باز دەگەڕا..یالێ بەیالێ.

لۆمەم مەکەن..

هەرچی دەڵێن گەردنی گومانتان ئازابێ.

دەی باوابێ...!!

ئەوە ناوم.. تۆماری کەن،

لەگەڵ ناوی(مەم وزین)و(لاس وخەزالێ).

بمکەن بەهاوڕێی(وەلی وشەم)،

وەکو(یوسف)بمخەنەچالێ.

ئێ من چیبکەم ،

بەخواگوناهی خۆم نەبوو..؟!

ڕۆژێ دوولیمۆی مزرم دی

لەژێرفانیلەی تەنك وپەمەیی وکالێ.

وەك(هێمن)...غەریبیم هەڵسا،

وەك ساواکەوتمە شنەشن،

وەك(نالی)کەوتمەناڵەنالێ.

لۆمەم مەکەن..

لەوساکەوە..

کانی حەزم ژیاوەتەوە،

پیری..لەدڵم تۆراوە،

وەکو(صۆفی)...

کەوتوومە (حاڵ).

چیم لێ دەکەن..

بێ منەت بن.

.بەپرچی بمکەن بەدارا،

بمدەنەبەر(جەڵدە)ی خەدەنگ.

رامگرن لەسێرەی تفەنگ.

لەبەرترسی خوانەبووایە،

یاملی خۆم دەشکاندبەپاڵ.

یاوەك(بلەشێت)*ی عاشق

دەمدایە بەر گاز و قەپاڵ.

١٩٩٨سلێمانی

---

*بلە.. شێتی رێگای عیشق بوو لەحەفتاکاندابەبازاڕی ( رەحیماوا) دەژیا

## ماڵۆچکە

نەم دەزانی

بۆنی پرچ وئەگریجەی تۆ

لەکاتێکدا..بەم پەنجانەم نەرم دادێ.

لەگەڵ گەڵاێ هەڵوەریوی بەربارانیدا

کامیان بۆنی کامیان لێ دێ.

کەچی ئەمڕۆ پاش نمەیەك،

زانیم هەردووك.

بۆنی ئەوخاکەیان لێ دێ

کەمناڵ بووین ،ئێمەی بچووك .

لەگوندە وێرانەکەمان،

لەپاڵ کەرکووك.

ماڵۆچکەمان لێ دەکردو

قوڕەکەیمان دەکرد بەبووك.

١٩٩٠ دۆڵەکۆگە

## خۆشەویستی

کەمن هاتم ،کەتۆ هاتی ..

هیچمان بەحەزخۆمان نەبوو،

رووداویك بوو خۆنەویستی .

کاتێ کەبوین بەدووهاوڕێی ..

خۆشم ویستی .

ئێستا ئێمە بووین بەدوانە

وەك ئاو وژیان .وەك ژیان ونان .

وەك ئۆکسجین و هەناسە .

وەك کەرکوك وچەمی خاسە.

وەکوهەتاو بۆ سەوزە گیا .

وەك عیشقی(شاخی)بۆ چیا.

وەك رەنگ بۆ گوڵ.

وەك خوین بۆدڵ .تۆپێویستی .

خۆشم دەوێی

وەك ماڵی بوونی باڵندە بۆهێلانە.

وەك هۆگری مناڵی زیت بۆجۆلانە.

وەك حەزی لاوان بۆ..وەرزش.

وەك دڵسۆزی خۆم بۆشۆڕش.

وەك دڵی سۆفی و مەولانە ..

وەك كۆڕی زیكری دێوانە.

وەك ناچاری ماسی بۆئاو.

وەك پێویستی سۆما بۆچاو.

وەك وزەی ..، ئە ت ۆ م پێویستی

ئاخر بۆیە خۆشم ویستی .

خۆشم دەوێی ..وەك عیشقی نالی وحەبیبە

وەكو داخوازی شەو بۆشەم.

وەك دێوانەیی  وەلی ..و شەم

وەك وەفای زین بۆ كاكەمەم .

ئێ من چیبكەم ..!؟كەبەدەستی خۆم نییە

خۆشتم دەوێ ...هەناسەكەم.

کەرکوك ٢٠٠٤

وانەی عیشق

تۆ..لەکام کۆلیژو زانکۆی

پێم ناڵێی لەکوێ دەخوێنی؟!

کەخوێندکاری پزیشکی نیت

بۆ وەك بازی چنگ بەخوێنی ؟!

من هەر سرکردنم ناوێ...

پێی ناوێ دڵم دەربێنی .

دڵنیام لەبەر زرنگیت

لە ئەزمووندا دانامێنی.

ئیتر بۆچی نیگەرانی

بۆسەرم لێ دەشێوێنی؟!

بێگومان لە(وانەی عیشق )

یەکەمی سەداسەد دێنی.

٢٠٠٥ کەرکوك

## شووشە

گیانە دڵت شووشە نییە،
خونچەی گوڵە .
چۆن دڵم دێ بیژاکێنم.
سینەت بنێ بەسینگمەوە
با دەم بۆناو دەمت بێنم.
گەرتۆ دڵی من نەشکێنی
من چۆن دڵی تۆ دەشکێنم.
٢٠٠٦ کەرکوك

## خەو

کەتۆ دەڵێی : تۆم حۆشدەوێ !.
کەتۆ منت لەخەیاڵەهەمووشەوێ.
وادەزانم هەموودنیاسەرمایەمە..
لەخۆشیداخەو لەچاوانم ناکەوێ.
٢٠٠٦ کەرکوك

## بازنەی پەیوەندی

ئەگەر لەدڵم بپرسن.

چی جیاوازە،

ڕەقی دڵی دڵدارەکەم

لەگەڵ دارا،لەگەڵ بەردا،

لەگەڵ ئاسن.؟؟!

ئەوهێشتاکە دڵی نایە

دەڵێ ئێوە دڵ ناناسن.

چونکە هێشتا

پەی بەقووڵی عیشق نابەن

لەبیابانی دڵداری هەر پێخواسن.

لەنێوانی دڵ ودڵ دا

چەندهێڵێك هەن قەت ناپچڕێن

ئەوهێلاٌنە..

بازنەی پەیوەندی وتەماسن.

٢٠٠٢ سلێمانی

## بولبولی دڵ

شەوێ هەڵفڕی بولبولی دڵم .

وابزانم رۆیی بۆخزمەت گوڵم.

لاشەی بەجێ هێشت بەسەد زامەوە.

تابەری بەیان ..هەرئەتلامەوە.

لەکازیوەدا کاتێ گەڕاوە،

هەستم کرد.. دڵم گەلێ گۆڕاوە.

قەفەسی سینەی لەلازیندان بوو.

لەگەڕانەوەزۆرپەشیمان بوو.

ئەوجا تێگەییم ئەودڵەبێعارە

بەدەست خۆی نییەوچاری ناچارە

نەجێی جارانی خۆی  دەگرێتەوە.

نەبۆلای یاریش دەگەڕێتەوە.

١٩٦٩

## سه فه ر

**گیانەکەم ...**

**ئایەدەزانی**

**هەرئەمشەو میوانم،دەڕۆم؟؟.**

**مەنزلم دووره ...**

**دوورلەتۆ...**

**چاوپڕلەگریانم ،دەڕۆوم.**

**هەرکەئێرەجێ دەهێڵم،**

**قرچەقرچی ریشەی دلّ دێ،**

**بریا دەتزانی کەچەندێ ،**

**بۆت پەریشانم ،دەڕۆم.**

١٩٦٩

## عاشق

ئەگەرعاشق

لەلۆمەی خەڵك ..بپرسێ.

ئەبێ لەخۆی،لەداروبەردیش بترسێ.

من ئەوکەسەم لا عاشقی تەواوە.

کە وەکوخۆم،لەنێوعیشقدا کولاۆە.

ئەگەر عاشق

خەیاڵە بکا ...لەمەرگی .

دەبێ هەردەم ،

قرچە قرچ بێت لەجەرگی.

من یاری خۆم خۆش دەوێ،

بەس بەمەرجێ. وانەکا...کە:

قەت دڵمان لێك بڕەنجێ.

١٩٦٩

# خاڵ

داد لەدەست ئەوتەنهاخاڵە

کەدەدرەوشێ لەسەر رووتا.

هەردەم حاڵم بۆی بێ حاڵە

وەك دوڕە لەســەر یا قوتا.

یا قووتە ؟ لەوسەرجەماڵە

بیللا.. ماچی بـۆم حەلاڵـە.

گەرنەبەخشی پێم..مەحالە

وادابنێن جەســتەم ســوتا.

گەربسووتێ هەموو جەستەم

لەتەوقی ســەر هەتـاقەدەم

شەرتەلەعیشقت کۆڵ نـەدەم

تــادام دەنێن لەتــابووتــا.....

١٩٦٩

## شين وشايى

بەئەويارە بلێن يــاران

حالْم پەريشــانە بێ ئەو.

وەك پەروانەسەراپاگيان

ئاكامى ســووتانە بێ ئەو.

شايى سەف لەدواى سەفابێ

عالەم هەمووى لەســەفابێ

ئەگەر دلْم بە وەفابێ

شين وقورپێوانە بێ ئەو .

شايى وســەيران بەمن چى

دلْشادى هەمووان بەمن چى

لێى نەبێ چاوجوان بەمن چى

پرســە و لەخۆدانە بێ ئەو .

گۆڤەند وياری وكێ بەركێ

سەیران وشایی وهەڵپەڕکێ

دۆی داوەت و ڕەشبەڵەکێ

خۆشی چی یە گیانە بێ ئەو .

چوونی خەڵکی بۆهۆکاشە

بۆخۆیان سەیرانە ، باشە

من بێزارم ..لەو شاباشە

ناچمە ئەوسەیرانە بێ ئەو

هاوین خەڵکی دەچنەبێخاڵ

خزم وکەس،پوورومام وخاڵ

من ناچم بەخەون وخەیاڵ

مەسیفیش زیندانە بێ ئەو

بەکورتی وبەکوردی پەتی

لەبەر بێزاری و نەگبەتی

وێڵی عیشقم بەپێی پەتی

دوزەخە ئەم ژیانەبێ ئەو.

١٩٧٥

## رێگای کانی

رۆژێك سەرلەبەیانی

یارم دی زۆربەجوانی

بەناز دەچوو بۆ کانی

رۆح و هەناویە کێشا.

بە لەنجەولاری.. شۆڕێ

دەرۆیی هەروەك پۆڕێ

ئاخردڵ چۆن نەگۆڕێ

مەیلی تەواویە کێشـا.

بازنەو خەنە لەدەستا

لەسەرئاسۆگە وەستا

لەسەردڵم وەك وەستا

نەخشی دوو چاویە کێشا.

یارهەنگ بوو،رۆحم شیلە

بە قامك و ئەنگوستیلە

نازانم ..؟ ئەو نەشمیلە

رۆحم یا ئاویە کێشا ؟!

١٩٦٩

# مۆبایل نامه

هەمووشەوێ.

دڵم وەك منالّی ساوا،

ورك دەگرێ ودەزیرێنێ

قەت بەهیچ كەسێ ناسرەوێ.

تەنیا باوشی تۆی دەوێ.

★★★

هەمووشەوێ.

جووتێ كۆتری سپی سپی..

شیعرێكم دەنووسنەوە..

ناگمێنن..!

لەسەرسینەی سافی وەك مەڕمەڕت

دێنەخوارێ،لەجمینن.

بەجووله جوول رۆحی منیش دەجوولێنن.

★★★

هەمووشەوێ.

دووكوكوختی بچكۆلانه.

دێنه سەر دارتەلی سەرم

رۆحم دەكەن بەجۆلانه.

هەر دەچڵی پەنجەكانم

بۆخۆ دەكەن به هێلانه.

دەنووك دەژەننه ناو دەمم

خۆیان دەكەن به هاودەمم

دەبن بەهاوبەشی غەمم

بۆبەیانی ..

تۆوەره سەیری حاڵم كه

شاگەشكەم و...

من بۆخۆم ..پاشای عالەمم.

٢٠٠٨ كەركوك

## یەکتاپەرستی

ئەوسەردەمەی ئەوان هاتن بەپێخواسی.

ئەوساکە.. باوانی ئێمە

هەربەتەنیا خوای دەناسی.

هاتن ..دەست بەشمشێرەوە

زۆرکچیان بەتالأن بردین.

تاوانمان ئەوەبوو کوردین...

بۆئەوەی ناموسمان نەبەن!

بۆئەوەی تالأنمان نەکەن،

بۆ دەربازبوونمان لەئەنفال،

بۆرزگاربوونمان لەمردن.

هەرچی پایەی باوەڕیان بوو

هەمووومان لێ پەسندکردن.

وامان زانی لەخواپەرستیدا شازن .

بۆئاشتی وبۆبرایەتی ...بەردەبازن.

خۆشی بۆمرۆ دەخوازن.

کەچی هێشتا ..لەدوای پترلەهەزارساڵ.

جارێکی دی ئەنفال ..ئەنفال..

ئێستایش تەماشامان دەکەن

وەك موالی ..بەقینەوە .

ئێستایش ئەگەر دەستیان بڕوا

قڕمان دەکەن ..بەدزی وبەتەقینەوە

ئەگەر وابێ ...

دەبێ ئێمەیش بەخۆماندا بچینەوە.

کۆیلایەتی قەبووڵ نەکەین،

دیسان خۆمان بکڕینەوە.

لەگەڵیاندا بیبڕینەوە.

وەك(شێخی نەمر)و(بارزانی)...

سەرو خەنجەر بکرینەوە .

هەردەستێك هات بۆ سەر(دڵ)مان

بڵێین :بەسە !!ئەگەر هەرنەگەڕایەوە،

لەباسکەوە بیبڕینەوە .

٢٠٠٨\٩\٦ کەرکوك

## ڕەوشت ⋆

دووڕەوشتە...

وەك ئاوی سپی وڕەش وایە.

یەكیان سەرچاوەكەی دوزەخ

هی ئەوی تریان بەهەشتە .

خۆت بەراوردی كە لێرە.

ئاوی جۆگەی بەهەشت شیرین،

ئاوەكەی ترتاڵ و شوێرە.

⋆⋆⋆

دوو پەیامە.

پەیامێكیان برایەتی..

هەروەك یەكی وخێروبێرە .

خاوەنی پەیامەكەی تر.. شۆڤینییە،

لەئاست بیستنی راستییەكان..

كەڕولاڵە، كت وكوێرە.

⋆⋆⋆

**دوو مێژوو وه..**

**مێژوو یەکیان**

**مێژووی شەڕو..پەلاماروزوڵم وزۆره.**

**تەماشای فەرهەنگیان بکەی،**

**(هەلهولەو تالآن وسووتان)جێگای زۆره.**

**( حەرس قەومی ومقاوەمە )و ...**

**سەدان ناوی جۆراوجۆره.**

**هەر ئەنفال وئاوارەیی..**

**هەرفەرمانی دیکتاتۆره.**

***

**دوومێژووه...**

**مێژوویەکیان**

**هەربینینی زەبرو زەنگەو..سەرگەردانی.**

**ئاوارەیی ومالْوێرانی.**

**چەوسانەوەو پەرێشانی.**

**روخانی دێر...و مزگەوتان**

لەکۆنەوە هەتا ئێستا.

سوتانی (مەسحەفارەش) و

(قورئانەکەی خوا)و (ئاڤێستا).

هەرلەسەردەمی نووزی یەوە،

تا ..ڕمانی قەلاّکانی پاشای کۆرە.

بەلّگە..زۆرە.

***

دوومێژووە

مێژوویەکیان لەکۆن ونویّ،

لوتکەی هەلّوێستی ئینسانە.

دوێنی (( قەندیل بەغدای هەژاند))

کەسێك دیلێکی نەکوشت و...

تۆلّەی ئەنفالێکی نەساند.

سنوورەکەی  خۆی نەبەزاند.

***

دوومێژووه..

مێژووەکەی تر

دوای روخانی پاشای لەرزۆك

دەرهێنانی لە ژێرزەمین،

لە دوای پاڕانەوە ی سەرۆك

((قائدالچرورە)) ی ((جبان))

سەربازی فشەو ترسنۆك

ئێستایش هەر شکانی پێنووس،

کوشت وبڕوشەڕوشۆرە.

کوشتنی (عمر)و)علی)و

( حەمەبۆر )ە

★★★

دوومێژووه..

میژوویەکیان

وەك شەونمی بەیانیانە.

وەك پەڕەی گوڵ گەش وجوانە:

کاتێ کۆترۆکە سپییەکان..

لەدار تەلەکان دابەزین.

کاتێ شەپۆلی لاوەکان ...

وەك برێشکە..هەڵدەبەزین.

شەقام پڕبوو لەبانگەواز.

مامۆستا پێشڕەوی گەل بوو

سروود دەخوێندرا  بەئاواز.

با لافیتەی خوێناوییان

لەئەرشیفی نەتەوەیی بپارێزێ:

- (( لێرە ناڕۆین ))

- (( بەڵێ بۆماددەی ١٤٠ ))

- (( نەخێربۆ بەندی ٢٤ ))

- ئەوەی دژی ئەم شارەبێ..

سەری شۆڕە.

لەگەڵ گرمەو تەقینەوە

تەرمی دەیان

(( کوردوعەرەب وتروکمان))

خوێنیان تێکەڵ بوو لەوگۆڕە.

★★★

دوومێژووە

مێژوویەکیان

وەك پەلکەزێڕینە جوانە.

سەوزوسپی وزەردوسوورە.

دەستێکی لافیتەی ئاشتی ..

دەستەکەی تر یەکسانییە.

دەنگی راستی وئینسانییە.

بانگی کۆمەڵی ئازادو بێسانسوورە.

مێژووەکەی تر

مێژووی ترس وتۆقاندن و...

بەرنامەی داگیرکەرانە .

رەوشتی داڵەکەرخۆرە.

هەروەك لاپەڕەی نەگریسیان

تەژییە لەکەڕووخۆرە.

ئەوە ((قەلاّ ))چاوی لیّ بوو

کۆمیتەی...(( ئاگر ))شاهیدە

هەر (( T.N.T)) و...

مەرگی خەڵك و تەقینەوەو...

تاوانەکانی تیرۆرە.⋆

٢٠٠٨\٩\٦ کەرکوك

---

⋆ ئەم شیعرە بۆ هەردوو تەقینەوەکەی بەردەم کۆمیتەی ئیمام قاسم و

تەقینەوەی خۆپیشاندانەکەی ٢٠٠٨\٧\٢٨ نووسراوە •

## سەربازی.. ★

بەناوی یەزدانی مەزن.

بۆ/ باوکی دڵسۆزی من.

ئەوباوکەی بەکولەمەرگی .

بەخێوی کرد کزەی جەرگی .

لەپێش هەمووشتێك سلاو.

هەواڵ پرسین نەبێ تەواو.

ئەوجا ..وابەموختەسەری.

بۆت دەنووسم دەردەسەری:

له(منصوریه) وه چل نهفهر.

رهوان بهغداکراین یهك سهر.

بیَ راوهستان ..باوه حاجی

براینه سهربازگهی( تاجی)

ههر له سهیاره دابهزین .

گوتیان:بۆتان نیه تهعین.

(لاچای لا قصعه لاصمون

ماکو لکم مستجد یدون.)

ئێمه سیمان هی شمال بووین

لهبهر برسێتی بێحالَ بووین.

وا ههبوو دههات بگریێ .

کۆم کردنهوه بۆتهگبیریێ.

پێیانم گووت: برایینه!!

(بهرخی نێر بۆسهربرِینه.)

پاره خۆی بۆرِۆژی تــاره.

گووتیان دهبلێ گیانهچاره.

گووتم :کێتان شارهزایه .

بابرِوات ئهوه بهغدایـه.

نان بکڕێ وبەغار بێتەوە.

گیان هەمووومان بکڕێتەوە.

هەمووومات بوون ودڵحەزین.

بۆم دەرکەوت.. شارەزانین .

پارە کۆ کراوە.. ...لەوێ.

دینار و ربع چی وای ناوێ.

چوومە بەغدا بۆکازمی.

هەتاکو بکڕم لا زمی .

چوومە سەر فڕنی عارەبێ

کەوتمە قسە هەرچۆنێ بێ

بە بۆڵەبۆڵ و گیزەگیز.

وتم:( عمی جیب ١٠٠خبز.

گال ١٠٠ خبز شی تسوی بی)

گووتم ( للاکل یا گلبی .)

بەهەر نەوعێ بووتێمگەیان

١١٠ نانم لێ ئەستان .

دام دینارو دووپەنجایی .

وتی:( ها خویە وین جای ؟)

هیشتاکە وەستابووم لەدوور

چوومەپێش وتم:(من منصور)

ناو کیسێ زل باش نایتوانم.

نانم هەڵدایە سەرشانم .

لەنێوبازاڕدا وەکو دۆم .

نان لەبان شان ورد دەرۆم.

چووم بۆ ( منگقە...)ناعیلاجی.

بە(٥٠) سواربووم بۆ تــاجی

لە ( باب النڤام) بۆ (کتیبە).

(٢٠)دەقیقەیش بەشان بیبە.

الحق کەچاویان کەوت پێم .

پیاوڕاست بڵێ هاتنەسەررێم .

نانیان لەبۆم هەڵگرت بەشان.

بەش بەشمان کردپاش پشوودان

هەموو ڕۆژووی خۆمان شکان!!

کردمانە جەژنەی ڕەمەزان .

بەیانی...کاتێکمان زانی .

یەك باوش ئەوراقیان هانی

گووتیان:( شویه مستعجل !

جماعه الکاکات .. نقل )

هاوردیان ..گەلاَبە وجیێب.

بردمانیان بۆ (أبو غریب)

ئەبوغریێب لەخوار (بغداد)ە

گویێم لێ بوو گووتیان(تعداد)ە

زۆر بەپەلەو بە دەست وبرد .

لەبەر باران ریزمانیان کرد .

یەکیێك کەچوارخەت لەقۆلێ بوو

سەد سویێندتەخواردجنی چۆلێ بوو

د دان سپی، دەمووچاو ڕەش

زۆرپیس و تووڕە و مشەوەش .

قیڕاندی ( یالله مستعجل

کل واحد شیل گاس ومعول )

هەموو هەلْمانگرت تاس وپاچ.

گەچاوی بووین لە سەرتا قاچ

کورت بیێژم .... نەوەك دریێژا

من چەند رۆژ هەر گەچم بیێژا

قەینا...هەرخۆشە لەگیانم

بۆچی ؟ خۆ تۆزێ تێرنانم

ئیتر... لەکۆتایی نووسراو

هەمە بۆگشت لایەك سـلاو..

گیانە کەم بەخوام سپاردن.

بەپەلە ئەم نامەم بۆناردن.

نیسانی١٩٧٢ بەغدا

---

*دەقی نامەیکی شیعریە کەلەکاتێکدا سەربازبووم لەبەغدا

و بەشێوەیەکی ناشایستە وەك سەردەمی کۆیلایەتی

شەوورۆژکاری قورسیان بەسەربازەکوردەکان دەکرد،

لەنیسانی ١٩٧٢ دا بۆباوکم رەوانەم کرد...

## بێگار ..

- ماندوو نەبی مام نالە !
+ وەی خوا خۆشتکا بالە.
ـ ئەمساڵ ئەحواڵت چۆنە؟
+ قوربان وەك ساڵی کۆنە.
ـ ئەی کارت چی یە ئەمساڵ؟
+ کۆکە و گریە و نـاڵە ناڵ.
زیـــاتر کار نییە بیکە م .
بێ نان بێ پووڵ بێ تیکەم .
لەدەست زۆردارهەی هاوار.
پێم دەکـات کاری بێگـار .
کاری ( بێگار ) بێ پـوولـە .
لە ژێرچنگ سەگ وتوولە.
کـاری بـەزۆر بـەمەترەق .
بە جووێن ،بەزللە ،بەشەق .
بەپـاڵ،بەتف،بـەکوتە ك.
- بێ غیرەت دەس دەرەچەك.!
+ ها هۆ.چەنددەمت ڕشتە.
هەزارانی لەپشـــــــتە.
خۆ من ناوێرم پێیان ...!

مەگەردەستكەم بەگریان.

- نا نا  تۆبی خوا ...مەگیڕ!

هەر دەفەوتێ  سەگی پیر !!

هەر كە سەگە پیر تـۆپی .

دەیكەین بەشایی وچۆپی .

روولە دەرگای یەزدان كـە .

بێژە....دەردم دەرمان كـە.

بەلاَ .. لابـەر، هـەر ئــەوە.

سەگ هارعومری چل شەوە.

+ دەك دەمت خۆش بێ بالە!

ــ وەی خواخۆشـت كا نالە!!

١٩٨٠

---

٭ ئەم دەمەتەقێ یە  لەنەورۆزی ساڵی ١٩٨٦دا  لە گوندی ( قزلو )ی دەشتی كۆیە وەك شانۆ گەری یەك لەلایەن شاعیر و(مامۆستانەعمان) وە  پێشكەش بەئامادەبووان كرا .

## مـردن

قەت مەبەستەپشت بەجیهان

سەدساڵ...بژی،دەبێ بمری.

بۆکەس تا سەرنامێنی ژیان

سەدسال بژی دەبێ بمری.

گەردنیاگشت بکەی زەوت

کاتێ ئەزانی پێت هەڵکەوت

( کل نفس ژائقه الموت )

سەدسال بژی دەبێ بمری.

جیهان بۆش و پڕ و پووچە

پڕهەڵدێروکەندو سووچە

مرۆڤ تادوای کەوێ سووچە

هەرچەندبژی دەبێ بمری.

مادام مردنت لەپێشە

سوودت ناداتکاو کێشە

چاکە بکەو..پێت راکێشە

رزگاریت نابێ هەردەمری.

١٩٧١/٥/١٥ دێی بیرەسپان

## جەژنی سەری ساڵ

پێشکەشە:بەمناڵانی کوردستان

مناڵەکان

ئەمرۆ ..جەژنی سەری ساڵ بوو.

لەسەرانسەری دنیادا .

لەوڵاتانی ئازا دا ،چی مناڵ بوو.

بەزم وسەیران وشادییان لەخەیاڵ بوو.

بەڵام ئێوە ..لەکوردستانی کەلاوە

وەك مناڵی گەلانی تری چەوساوە.

دوورلەخاك وکەسوکارتان .

یا ئاوارەی هەندەرانن .

یا لەکوچەی شارەکان دا..

سەرگەردانن .

دوورلەوشەی کوردی ڕەسەن.

بێ مامۆستا وقوتابخانە.

واکسی دەکەن بۆ بێگانە.

یا لەئۆردوگاکانی مردن .

لەسەر مەرزی عێراق ـ ئوردن.

لە پاڵ بۆڕی خوێنی دڵم ..،

برسی وچڵکن .

چاوەڕوانی..

یەك قومێ ئاوی شیرین و

لەتێ نانن .

نەغەدە ١/١ / ١٩٨٩

شیعری منالاّن

## کەروێشك

کەروێشکێ رۆژێ لەرۆژان.
بۆئاو رۆیی بۆ دارسـتان.
کانی لەبن داره سێوێ بوو.
داره سێو، لەپـالێ کێوێ بوو.
کاتێ دەمی نایـــه ناو ئاو.
سـێوێ کەوته خوارلەناکاو.
کەروێشکه، راپەڕی ،هەلاّت.
بێ ئەوەی سێوه بەدی کات.
راکردنێ ، وەکو با وا.
وارای ناکرد لەکات ڕاوا.
لەناکاو دا ، ڕێوی فێلّباز.
هاته سەر رێ ی بەقەلّەمباز.
پرسی ئەوەبۆ ڕادەکەی ؟
لەترسی چی هەرادەکەی؟

ئەو کەروێشکە پەشۆکاوە.
زۆر پەلە وەلأمی داوە.
کورە ڕێوی زووکە هەڵێ.
هەتا دەستت کەوتووە هەڵێ.
لێرە بەولاوە شڵپە یە.
دڵم .. پڕی لەخرپە یــە.
لێقەومانە .. زرپە زرپە.
خۆت رزگارکە بەبێ چرپە.
بەبێ لەل ڕێوی سـەلما ندی.
بەدووی‌دا هەلأت،قووچاندی.
بە جووتە واڕایان دەکرد.
لەترسان هەرایان دەکرد.
لەگوێ ی چەمێ لەناو دۆڵێ.
گەیشتنە پیرە چــەقـەڵێ.
چەقەڵ پرسی بۆ ڕادەکەن؟
لەترسی چــی هەرا دەکەن؟
وتیان کوورە ڕاکە چەقەڵ !
خۆقووتارکە بەپەلە پــە ل !

لێرەبەولاوە  شڵپە یـە .

دڵمان پڕی لە خرپەیـە .

هەرزیرەیە و  ترپە ترپـە.

ئەتووش ڕاکە  بەبێ چرپـە.

بەڵێ.. چەقەڵیش سەلماندی.

بەدوویان کەوت و قووچاندی.

بوون بەسێ ..واڕا یان دەکرد.

لەترسان  ..  هەرایان  دەکرد.

لەقەد پالێ ، لەنێو زوورگێ.

دێتە پێشیان   پیرە گورگێ.

گورگ دەڵێ: بۆڕا دەکەن ؟

لەترسی چی  هەرا دەکەن؟

دەڵێن : قوربان گۆڕت  ورگە.

قەت دەرباز نابیت لەم زورگە.

بەڵێ..بێ سێ ودووسەلماندی.

ئەویش لەگەڵ وان  قوچاندی.

بوون بە چوار.. وا ڕایان دەکرد.

لەترسان ..هەرایـــان  دەکرد.

لەبێشەیەك ، لەسای دارێ.
تووشیان هات پیرە کەمدیارێ.
کەمتیار پرسی.. بۆ ڕادەکەن ؟
لەترسی چی هەرا دەکەن ؟
وتیان : هیچ ددان و هێزێ.
لەم ترسە تۆ ناپارێزێ.
بەڵێ دەرپەڕی ..ســـەلماندی.
بەلۆقە لۆق بۆی قوچـــاندی.
هەتا لەچیا کەوتنـە سـەر.
چوونەلای پاشای جانەوەر.
بوون بەدەیان دەعبـــای کێوی.
هەمووی تەتەڵەی بوو لێـوی.
لەوێ ..ڕێوی کەوتەپێشیان.
بووبە چاوساغ وپەلکێشیان.
شێر ..نەڕاندی :چی قەوماوە ؟
هەموو بەغاردێن لـــەو لاوە ؟
گشتیان پێکەوە وچانێ :
گەورەم ..مام ڕێوی دەزانێ.

شێر ..وەکو درِندەی کێوی.

هەڵمەتی بردە سەر رِێـوی:

چیت بیستووە ؟ ئەی بێ مێشك!

گە..گە ورەم.بیستم لەکەروێشك.

شێر نەرِاندی : بانگی کەن بۆم.

درۆ بکا شەرت بێ دەیخۆم.

شەش حەوتێکیان بەدەست وبرد.

کەروێشکەیان.. ئـــامادە کرد.

کەروێشك کەوتە گفتوگۆ :

گەورەم با رِوون بێ لەلای تۆ.

چوومە بن دارێ بۆ سەراو .

خێوێ پەیدا بوو لەناکاو.

خێوی چی ؟ کردی بە شڵپە.

جەرگی پرِکردم لــەخرپـە.

ئیتر گەورەم گشت هەلاتین.

بۆ خزمەت بەرِێزت هاتین.

لەدوای هەراو کێشە کێشیان .

شێر ..وەکو شێر کەوتەپێشیان.

هەتا بەسـوك و ئاسـانـی .

سـێوەی  دەرهێنا   لە كانی .

ئیتر  خۆی ئاسا  نەڕاندی .

بەیەك قەپاڵێك ..خرماندی.

جا وتی :شەرمە بۆئێوە  !

زراوتان چووە لەم سێوە.

كاولەسوار ١٩٨٢

## ئازادی ★

لــە پێناوی ئــازادی دا .

لەپێناوئاشتی وشادی دا.

هەم لەپێناوی یــەکێتی.

گەلی ئێمە لەسەرگێتی.

خوێنی هەزارن لاوی رژا.

هەزاران گوڵی..لێ پژا.

بەسەدان لاو لەداردران

هەزاران ماڵ کاولکران .

رێی رزگاری دەبێ وابێ.

بێ هەوڵ هیچ پەیانابێ.

لەپێناوچوون ئەومنالأنە.

خەوتبوون لەسەرجۆلانە.

لەگەڵ گزنگی بەیــانا .

ناحەزدایان بەسەریانا.

ناحەزیدڕندەی مەغروور.

بە مرەمڕ دەچوونە ژوور.

لەپێــش تفەنگ تەقینەوە .

دوای هەلهۆ لە بەقینەوە:

ئەمانەش هەرمناڵەکوردن.

مەڵێن ئیـستا ساواو وردن.

لەدوارۆژدا دەبن بەلاو

بەئاســانی ناکرێن ڕاو .

لوولەی تفەنگیان نابووە دەم.

مناڵەیش مژی بووی وەك مەم .

بەدەم لوولەوە ٚکەنی بوو.

جارناجارەیش راچەنی بوو .

پێکەنین پەستی کردبوون.

بای ڕەگەز..مەستی کردبوون.

دوا ی هۆسەیە ك دە قیژانیٚ.

تەقە و!!، مێشکی دەپژێنیٚ.

**وەکوگوڵێ دەی پوشکێنێ .**

**بەخوێنی خۆی دینەخشێنێ.**

**کە خوێن دێتەخوار لەلانك .**

**دەڕژێتەسەرزەوی تك تك.**

**بەلاّم نێوئەو لانکە ..قوولە.**

**پێچرابوو ،نەی کردبوو جوولە.**

**کەدادەچۆڕێ خوێنی سوور .**

**جەرگ ودل دەکەن بەتەنوور.**

**سەدان واکوژرن بەبێ جەنگ .**

**تایبەت لە(سۆریاو(ئۆمەربەگ)**

**ئاوا بەخوێن منالّ ولاو .**

**بەدەربەدەری ومالّ سوتاو.**

**لەم وولاّتەدا گەلی کورد.**

**داوای مافی رەوای خۆی کرد.**

---

⋆ ئەم شیعرم لەکۆتایی ساڵی ١٩٦٩دا بۆکارەساتی شەهیدانی گوندی ( ئۆمەربەگ )نووسی و لەئاهەنگی گەورەی حەسار لەساڵی١٩٧٠ لەبەردەم خەڵکێی زۆردا خوێندمەوە.

**راپرسی کەرکوك ٢٠٠٤**

**بۆ دەبێ ئێمە وەکوکورد**

**باسی بێزاری بکەین.**

**بۆدەبێ هەردەم خەبات**

**دژی زۆرداری  بکەین.**

**ئاشتیخوازین و دەزانین**

**شەڕ هۆی ماڵوێرانی یە**

**بۆ دەبێ ناچارکرێین ..**

**تاشەڕی ڕزگاری بکەین .**

**گەرلەڕابردوودا لەمەیدان**

**گۆمان بۆدەرناکرا**

**وا شکورئەمڕۆ دەتوانین**

**باشترین یاری بکەین.**

**شەر..شەڕەودووبەرکی**

**وابەجارێ کوشتمی**

**پەتایەکی ترسناکە ،**

هەردەبێ چاری بکەین .

ئێمە.. دەستی برایەتی

بۆ گەلان درێژ دەکەین

گەرئەوان دیموکراتخوازن

ئێمەهاوکاری دەکەین.

وا لەئاسمانی (UN ) دا.

ئالأی گەلان دەشنێتەوە

دەبا(ئالأی کوردستان)یش

خۆمان خاوەنداری بکەین.

ئەم هەمووسنوورە تاکەی

بۆهەرپارچەپارچەبین؟؟

بائێمەش ڕاپرسی بکەین..

.بارێکەو باری بکەین .

بۆدەبێ تورك وعەرەب..

مافی ڕەوای خۆیان هەبێ

با ئێمەش وەك هەرگەلێك،

مافی خۆ.. دیاری بکەین.

بەرەوئاشتی

لەدوای زۆروچەوسانەوە.

جارێکی د ی حە سانەوە.

گلان،دیسان هەڵسانەوە

شـۆڕشی بێ پسـانەوە.

کۆ بووینەوە بە تاك وکۆ.

هەرهەموومان بوینەپشـکۆ

بووبەسـەنگەرمان کەژوکۆ

فیداکاری... هە تا نسکۆ..

تفەنگ لوولەی سەرەوژێربوو

چاوی سێرەی بڕنەوکوێربوو

راپێچ کردن سـەررەوژێربوو

مەنزلگەمان گەرمەسـێربوو .

ئا.. ئیتر لەو سەرو بەندە

هەمووبینیمان ئەو پەندە

نەك بژین وەك پەناهەندە

کراین بەکۆیلە وبە بەندە .

دوایی کاتێك گەڕاینەوە

کار نەبوو.. دەسوڕاینەوە

هەمیشە دەچەوساینەوە

ئێ بۆیە ..ناحەواینەوە .

لەلانە دەرچوین بەپەلە

بووین بەدەروێشی کۆمەڵە

گشت گوتمان ئەم هەلە،هەلە

ئەمە رێی ڕزگاری گەلە

گەڕاین هەردەوچیاوچۆل

وەکو رێبواری کۆل بەکۆڵ

کران بەبنکەدەشت ودۆڵ

هێز و هەرێم و لق و پۆل

بیزاربووین لەمان وژین

شکاندمان دەرگاوپەرژین

وتمان :کوڕی چیاوکەژین

(کەم دەژین وکەڵ دەژین!)

بۆیە وا بەکوڵ دەناڵم

ئەوزۆردارەی هاروزاڵم

بە تۆپ وتانك و ناپاڵم...

حەشری کردبەماڵ وحاڵم.

ئەوان و دەست نەپارێزان

ئێمەیش وەکو گەلاڕێزان

گەردن وپەت ،زام وگوێزان

کورد لەخاکی خۆ راگوێزان

بەجۆرێ بێزاریان کردین

خەوتبووین بێداریان کردین

بۆخەبات ناچاریان کردین

هەمووهاوارمان کرد:کوردین.

هەربەیەك چرکە ویەك خولەك

هزروهێز لەگەڵ خامە وچەك

(شۆڕشی نویٚ)سوپاوفەلەك.

هیٚزی هەمووومان بووبە(یەك ..)

چونكە ئیٚمە نەوەی  كوردین

هاتن  و..  ئەنفالیان كردین

كچانیان بەتالاٚن  بردین

بەلاٚم ئیٚمە هەر نەمردین .

وتمان بابەسبیٚ دانیشتن

زولٚم وزۆر،تیرۆر..و كوشتن

گۆڕی بە كۆمەلٚ ..وناشتن.

ئیترهەتا كەی خویٚن ڕشتن

دوای دلٚشكان و دلٚ برین

كیمیاباران و..  سەربڕین

وەك شیٚر لەلان دەرپەڕین

هەر هەموو پیٚكڤە ڕاپەڕین.

نیشتمانی جوان ئازاد بوو

رۆژ رۆژی مەرگی جەلادبوو

دوژمن بێزار و بەرباد بوو

دڵی میللەتمان گوشادبوو.

زۆرئازاو دلێر وچاپوك

گەڕاینەوە بەرەوکەرکوك

شارمان رازاوە، بووبەبووك

دوژمن پەڕی وەکو هەلووك

بەخۆمان دەرچووین لەغەمان

چیتر زۆردارانمان نەمان

بەخۆشی وشێنەیی وئەمان

بووین بە خاوەنی پەرلەمان.

کاسەکە پڕ بوو، بووتەژی

لەداخ شەڕی برا کوژی

ویژدان وناخی کورد هەژی

وتمان:بژی..کورد هەربژی .

لەوساکەوە کەیەك رێزین

دوژمن.. دەزانن بەهێزین

خاوەن بڕیاری بەپێزین

لەنێوخۆ وخەڵکا بەرێزین

ئێستاکە وا ریزمان سوارە

کوردستان لە دنیا دیارە

لە(بەغدا)دا کورد سەردارە

نابێ بدۆڕێین ئەم جارە .

کەرکوك ٢٠٠٤

# ژن وژنۆکە

## ١- ژن

لەم دیوکێوی حەمرینەوە

لەنشتیمانی ئەنفال وبرینەوە

لە( تۆبزاوا )

لەسایەی ڕەزێك سووتاوا

(مامۆستانەورۆز)کەهەڵسا

لەگەڵ گزنگی هەتاوا

وتی:من (پێشڕەوێ )کم هەبوو

لەنەورۆزێکدا ڕۆیشت و....

چی تر نەهاتەدواوە.

بۆیە ئەمڕۆمنیش دەڕۆم

دەست بەقەڵەم وئالأوە.

هەرئەورۆژە

**رۆژی بیست وهەشتی تەمموز**

**(زەکیەئالکان)**

**ئەونەشمیلەی بۆکوردستان**

**بووبەخەڵووز.**

**لەگەڵ(زیلان)و(پەرژین)دا**

**هاتنەکەرکوك.**

**ئالآیەکی خوێناوییان لێ وەرگرت و،**

**گەڕانە دواوە زۆرچاپووك.**

**وتیان ئەم ئالآیە دەبەین**

**بەتەبەڕووك.**

**لەرزگاری یەکجارەکی کوردستان دا**

**هەڵیدەدەیەن ..**

**لەگەڵ ئالآی ولآتماندا**

**لەشایی کۆمەلآیەتیش**

**دەیکەین بەتارا بۆسەربووك.**

**٢- ژنۆکە**

**لەودیوکێوی حەمرینەوە**

**ژنێکی جوان ورەشتاڵە**

**هەژاری وەك دێوەزمە...**

**چووبوەکوڵی**

**رەورەوەی شەڕودواکەوتن ..**

**دەیانبرد بەرەو کلۆڵی**

**بەیانی زوو..**

**چووبۆحەشارگەی تاوان و**

**وەکو کۆیلە..**

**لەبەردەم ڕیشنێك وەستا.**

**وتی :ئەی گەورەم مامۆستا.**

**من کەنیزەیەکی تۆم و...**

**واوەستاوم لەبەردەستا.**

**(ئەمیر)ەکەی**

**چەندین درۆی بۆهەڵبەستا.**

**هەرهەمووی لەکەللەی پەستا.**

**حەفتا هەیتەی بۆژماردو...**

**هەرخەنی کرد لەبەهەشتا.**

**کەمەربەندێکی(تی ئێن تی)**

**پێوەبەستا.**

**پاش چەند رۆژێك...**

**دۆزەخ دەرگای لێکردەوەو**

**لاشەکەی پارچەپارچەبوو**

**لەنێو گۆمێك خوێنی خەستا.**

**٢٠٠٨\٩\٦**

## نووسەر لەچەند دێڕێکدا :

★ ابوبکر محمد حاجی  ناسراو بە (مەلا شاخی)

★لەدایك بووی ١٩٥٣ دێی  بیرە سپان/ پردێ/ کەرکوك

★بەشداری (شۆڕشی ئەیلول)ی کردوە.

★لە (١٩٧٥)ەوە کادر وپێشمەرگەی (ی.ن.ك)بووە.

★ئەندامی یەکەمین پەرلەمانی کوردستان بووە.

★ئەند امی هەردووکۆنگرەی یەك و دووی(ی.ن.ك) بووە .

★ئەندامی (یەکێتی نووسەرانی کورد)ە.

★ئەندامی دەستەی دامەزرێنەرو لێپرسراوی بەشی ئەدەبی

(کۆڕی رۆشنبیری لاوانی کورد) بووە لەشاری (نەغەدە).

★ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (کرمانج) بووە.

★لە دامەزرێنەرانی( بنکەی رووناکبیری شەهید) و

بەرێوەبەری نوسینی گۆڤاری (شەهید)ە.

★یەکەم سەرنوسەری  گۆڤاری (کەرکوك) بووە .

★سکرتێری رۆشنبیری (کۆمەڵەی روناکبیری کەرکوك) بووە .

★ئەندامی (یەکێتـی ی زانایانی ئاینی کوردستان )ە

★ ئەندامی ( سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان ) ە

★خەلاَتی رێزوپێزانینی یەکیتی بە واژۆی مام جەلال وەرگرتووە

کەبەچەك وقەڵەم بەشداری شۆڕشی گەلی کوردستانی کردووە.

★نوێنەری (هەڤاڵ مام جەلال) ە لە کەرکوك .

## بەرهەمە بلاّوكرا وەكانی :

١- دا ستانی ئاوارە یی (شعر) نەورۆزی ١٩٨٩
٢- هۆرەی چیا (شیعر) شوباتی ١٩٩١
٣- سوتەن (دەربارەی مافی مرۆڤ) ١٩٩٢
٤- ئەنفال و شۆڕەبی (شیعر ئەیلولی ١٩٩٨
٥- شیوەنێك بۆرەندی خان (شیعر) ئەیلولی ١٩٩٩
٦- ئەنفالی خاڵخاڵاَن (یاداشت وبیرەوەریوئامار) ٢٠٠٠
٧- لەبیرەوەری ڕاپەڕین ورزگارکردنی کەرکوك دا ٢٠٠٠
٨ ـ فیدرالی لەنێوان لکاندن وجیابوونەوەدا ئایاری ٢٠٠١
٩- أنفال خالخالان چاپی عەرەبی ٢٠٠٦
١٠-Anfal.of.Khalkhalan چاپی ئینگلیزی ٢٠٠٦
١١- ئەنفالی ڕەش ٢٠٠٧
١٢ - دڵسۆزی کەرکوك ٢٠٠٧
١٣ — دیوانی شاخی ٢٠٠٩

